لەم ریوایەتەوە هەندێ شتی ورد هەیە جێگەی خۆیەتی ئاماژەیان پێ بدەین:

**١ـ** بڕیاری کۆکردنەوەی قورئان لە ئەنجامی ئەوەوە هات کە قورئان خوێنو حافزەکانی قورئان بە زۆری بەشداریی شەرەکانیان ئەکردو لە ریزی یەکەمی شەڕەکاندا بوون مەترسی ئەوە دروست بوو بە نەمانی ئەوان هەندێ لە قورئان لەناوبچێ، ئەوەش وانەیەکە بۆ زانایان و رۆشنبیرە موسڵمانەکان کە بەرزکردنەوەی ئالأی ئەم دینە کاری هەموو لایەکەو نابێ ئەوان خۆیانی لێ بدزنەوە.

**٢ـ** کۆکردنەوەی قورئان با کارێکە پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** نەشی کردووە، بەڵام مادامێك بەرژەوەندییەکی گەورەی تێدایە ئەو صحابە گەورانە پێی هەستانو ئەوەبوو دوایش هەموو موسڵمانان بەشدارییان کرد لەو کارە خێرەداو تا دونیا دونیایە خەڵك وەك سەروەرییەك باسی دەکەن بۆ عومەر وەك پێشنیارو بۆ ئەو ئەبوبەکر وەك بڕیاردەرو بۆ زەید وەك هەڵسوڕێنەرو بۆ صحابەی پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** وەك خەڵکێکی بەشدار لەو کارە گەورەدا.

**٣ـ** ئەو ریوایەتە ئەوە دەردەخات کە ئەصحابی پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** بەرەیەکی ناوازەو هەستیار بوون، لەلایەکەوە زۆر بە ترسەوە بڕیار لە کۆکردنەوەی قورئان ئەدەنو لە لایەکەوە خەمی فەوتانی قورئانیان هەیە کە سەرچاوەی وەرگرتنی بیروڕاو رەوشتو هەموو پرنسیپەکانی ژیانە لەلایەکی تریشەوە ئەوکارە ئەوەندە گەورەیە لایان گواستنەوەی کێوێك ئاسانترە لەو کارە، کەچی ناوی خوای لێدێننو بڕیاری لەسەر ئەدەن.

**٤ـ** لە ریوایەتەکەوە کەشو هەوای خۆشەویستی و برایەتیو موسڵمانێتی بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە کەس رای خۆی ناسەپێنێ بەسەرکەسداو لە رێگەی حیوارو گفتوگۆوە بڕیار لە مەسەلە چارەنووسەکاندا ئەدەن و کەراشیان دێتە سەر کارەکە هەموو بەدڵو بە گیان کاری بۆ دەکەن وەك ئەوەی هەر لە سەرەتاوە رایان لەسەری بووبێت!

**٥ـ** لەو ریوایەتەوە دەردەکەوێت هەڵبژاردنی (زەید) بۆ ئەو کارە لەبەر زۆر هۆی گرنگ بووە، لەوانە:

أ ـ پیاوێکی گەنجو بە تاقەت بووەو لە ترۆپکی وزەو وەرەدا بووە، چونکە ئەو کاتە تەمەنی (٢١) ساڵان بووە، وەك هەندێ لە زانایان ئەڵێن.[1]

[1] عثمان بن عفان، شخصيته وعصره، الصلابي، ص٢٤٨. ئیبن کثیر لە (البداية والنهاية: ٥/٣٧٠)دا ئەڵێ: کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وآله وسلم) تەشریفی چووە مەدینە، "زەید" یازدە ساڵان بوو، بۆیە کە شەڕی (بدر)

ب ـ کەسێکی شیاو بووە بۆ ئەو کارە، چونکە خاوەنی (عەقڵێکی چاك) بووەو توانای لەبەرکردنو بەدواداچوونی زۆر بووە، تەنانەت کە پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** ئەچێتە (مەدینە) داوای لێ ئەکات خۆی فێری زمانی یەهودی بکات (واتە: زمانی عیبری)، زەید لە (پازدە رۆژ)دا فێری زمانەکە ئەبێت، زەید خۆی ئەفەرموێ: کە پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** هاتە مەدینە بردمیان بۆ خزمەتی، زۆر سەری لێم سوڕما، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا **(صلى الله عليه وآله وسلم)** ئەمە یەکێکە لە کوڕانی (بەنی نەججار)و نزیکەی نۆزدە سورەتی لە قورئان لەبەرکردووە تا ئێستا، پێغەمبەر ئەوە سەرنجی ڕاکێشاو فەرمووی: **"يا زيد تعلم لي كتاب يهود فأني والله ما آمن يهود على كتابي"**. (زەید خۆت فێری نووسینی جولەکە بکە بۆم، چونکە سوێند بە خوا جولەکە بەدەست پاك نازانم بۆ نامەکانم)، زەید ئەڵێ: پازدە شەو تێنەپەڕی زۆر بە چاکی فێری نووسینی زمانەکەیان بووم، هەر نامەیەکی ئەوان بهاتایە ئەم خوێندەوە بۆ پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** و هەر نامەیەکیشی ببوایە بۆ ئەوان بۆم ئەنووسی.[١]

ج ـ پیاوێك بوو جێگەی متمانە بووەو کەس قسەی لەسەر نەبووە و پەسەندیدەی پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** بووە، بۆ کاری واش هەر ئەو جۆرە پیاوانە ئەبێت تەرخان بکرێ بۆ دڵنیایی زیاتری خەڵك.

**د ـ** خاوەن ئەزموونێکیش بووە لەو مەیدانەداو یەکێك بووە لە نووسەرەکانی **(وحي)**، نەك هەر ئەوە، بەڵکو زەید بە (کاتب **الوحي**) یان (کاتب الرسول **(صلى الله عليه وآله وسلم)**)[٢] ئەناسرا لەناو صەحابەو لەسەردەمی پێغەمبەردا **(صلى الله عليه وآله وسلم)**.

هـ ـ لە سەرووی ئەمانەشەوە (زەید) لەلایەکەوە هەموو قورئانی لەبەر بوو،[١] لەلایەکیشەوە ـ مصحف ـ ێکی خۆی هەبوو، کە زانایان ئەڵێن: بۆ کۆتا جار پیشانی پێغەمبەری **(صلى الله عليه وآله وسلم)** داوە لەو ساڵەدا کە کۆچی دوایی کردووە.[٢]

---

روویدا لەبەر منداڵی نەیانبرد بۆ شەڕو هەروەها بۆ ئوحودیش، یەکەم شەڕێك بەشداری تێدا کرد شەڕی (خەندەق) بوو، پاش ئەوە بەشداری هەمو شەڕەکانی کردووە.

[1] البداية النهاية، (٥/٣٧٠). "ئیبن کثیر" ئەفەرموێ: ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە. ئیمامی بوخاریش لە (کتاب الأحكام، باب ترجمە الحكام)دا ئەم فەرمودەیە ئەهێنێت . (إرشاد الساري: ١٠/٢٥٨).

[2] ارشاد الساری، (٧/٤٤٩).

جا حەزرەتی ئەبوبەکر (رەزای خوای لێ بێت) هەستا لیژنەیەکی لە حەزرەتی عومەرو زەید دروست کرد بۆ ئەو کارە بەرنامەیەکی وردی بۆ دانان دەربارەی چۆنێتی کارەکەیان:

:پێی وتن: لەبەردەم دەرگای مزگەوتدا دابنیشن و هەرکەس هەر قورئانێکی لابوو بە دوو مەرج لێی وەربگرن.

یەکەم: بە نووسین هەبێت لای یەکێك.

دووەم: یەکێك لەبەری بێت.

ئەبوداوودی حەدیسزان ئەفەرموێ: عومەر (خوای لێ رازی بێت) رایگەیاند هەرکەسێك شتێکی لە قورئان لا هەیە و لە پێغەمبەری خوا (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ی وەرگرتووە بابیهێنێ بۆمان". [3]و ژمارەیەك صەحابە دانران بۆ نووسینەوەی ئەو قورئانانە و ئوبەی کوڕی کەعب بۆی ئەخوێندنەوەو ئەوانیش ئەیانووسی. [4]

هەر ئەبوداود ئەفەرموێ: "وكان لا يقبل من إحد شيئا حتى يشهد شاهيدان". [5] هیچیان لەکەس وەرنەدەگرت ئەگەر دوو شایەتی پێنەبوایە.

ئیبن حەجەر (رحمه الله) ئەفەرموێ: "**المراد بالشاهدين: الحفظ والكتابة**". [6] مەبەست بەدوو شایەت ئەوەیە: هەبێت لەبەری بێتو هەبێت بە نووسراوی لای هەبێتو تەنیا یەکێکیان بەس نییە. ئەوەتا زەیدی کوڕی ثابت ئەفەرموێ: کۆتا ئایەتی سورەتی (التوبه)م تەنیا لای ئەبی خوزەیمە دەست کەوت (واتە بە نووسراوی)[7]، ئەگەرنا خۆ زەید خۆیو عومەرو ئەبوبەرکو زۆربەی صەحابەش ئایەتەکەیان لەبەربوو، [8] ئەم لیژنەیە نزیکەی دوو

---

1 سير أعلام النبلاء، الذهبي، (٤٣١/٢).

2 علوم القرآن، لأحمد عادل كمال، ص٤٨، ٤٩.

3 أرشاد الساري، (٤٤٧/٧).

4 ارشاد الساري، (٤٤٩/٧).

5 ارشاد الساري، (١٦٤/٧).

6 مباحث في علوم القرآن، مناع القطان، ص١٢٢.

7 إرشاد الساري، (٤٤٧/٧)، قەسطەلانی لە (إرشاد الساري)، ١٦٣/٧دا ئەڵێ: (فالمراد بالنفي نفي وجودهما مكتوبين لا نفي كونهما محفوطين).

8 مباحث في علوم القرآن القطان ص١٢٢.

ساڵ[1] خەریکی کۆکردنەوەی هەموو ئەو صوحوفانە بوون کە لای خەڵکی هەبوونو گشتیان لەیەك (مصحف)دا کۆکردەوە بەو شێوەیەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا وەرگیرابوو.

جیاوازی ئەم نووسینەوەو کۆکردنەوەی قورئانە لەگەڵ سەردەمی پێغەمبەردا **(صلی الله علیه وآله وسلم)** چەند شتێکە:

- لەسەردەمی پێغەمبەردا هەر پارچەی لای یەکێك بووەو لە یەك (مصحف)دا کۆنەکراوەتەوە.

- لە سەردەمی ئەبوبەکردا هەمووی لەیەك (مصحف)دا کۆکراوەتەوە.

- لە سەردەمی پێغەمبەردا **(صلی الله علیه وآله وسلم)** قورئان بە بەش بەشو پرشو بڵاوی هەبوو، واتە هەبووە لە سورەتێك چەند ئایەتێکی لابووە، یان لە قورئان چەند سورەتێکی لابووە کە ریزبەندی تێدانەبووە.

- لەسەردەمی ئەبوبەکردا (رەزای خوای لێ بێت) هەمووی ریزبەندی کراوەو بەو شێوەیەی کە لە خزمەتی پێغەمبەردا **(صلی الله علیه وآله وسلم)** وەریانگرتووە نووسیویانەوە، چونکە نووسینەوەو دانانی سورەتەکان و ئایەتەکان کارێکی تایبەتە بە پێغەمبەری خواوە و ئەویش بەوشێوەیە گەیاندوویەتیو دایناوە کە خوای گەورە فەرموویەتی.[2]

- جگە لەمانەش ئەم کۆکردنەوەیە تەنیا قورئانی تێدا نووسراوەتەوەو هیچ جۆرە تەفسیرێك، یان شەرحێکی لەگەڵ نەبووە، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا **(صلی الله علیه وآله وسلم)** هەبووە لەگەڵ قورئانەکەدا، تەفسیریان شەرحیشی نووسیوە بۆ زیادە تێگەیشتنی خۆی.

- ئەم کۆکردنەوەیە ئەوپەڕی وردەکاری و مەرج و ئیحتیاتی تێدا کراوەو بەشێوەیەکی زانستی نووسراوەتەوە، بەڵام ئەم حاڵەتە لە سەردەمی پێغەمبەردا **(صلی الله علیه وآله وسلم)** بەو وردییە نەبووە.

---

[1] هەندێ لە زانایان ئەفەرموون: (دوو ساڵ، یان سێ ساڵ)ی خایاند. علوم القرآن، أحمد عادل کمال، ص٤٨. بەڵام دروست ئەوەیە کە کە لە ساڵی یازدەی کۆچییەوە دەستی پێکراو پێش مردنی خەلیفە ئەبوبەکر لە ساڵی سیازدەی کۆچیدا بە کۆکراوەیی لە ماڵی حەزرەتی ئەبوبەکردا دانرا، (تأریخ القرآن، محمد طاهر الکوردي، ص٢٨).

[2] عثمان بن عفان، الصلابي، ص٢٤٩.

ـ ئەم نووسینەوە تەنیا ئەو ئایەتو سورەتانەی تێدا نوسوراوەتەوە کە (نەسخ) نەکراون، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەمەش رەچاونەکراوە.

ـ ئەم کۆکردنەوە (ئیجماعی ئوممەتی ئیسلامیی) لەسەر دروست بوو، بە پێچەوانەی ئەوانەی سەردەمی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) کە زۆرتر کاری شەخصی بوون.

بەو شێوەیە قورئان لە سورەتی (الفاتحە)ەوە تا سورەتی (الناس) کۆکرایەوەوە هەمووی خرایە نێوان دوو بەرگەوەو تەسلیم بە حەزرەتی ئەبوبەکر کراو لای ئەو مایەوە تا کۆچی دوایی کردو پاشان لای عومەر مایەوەوە تا ئەویش کۆچی دوایی کردو پاشان خرایە لای حەفصەی کچی عومەرو دایکی موسڵمانان (رەزای خوا لە هەموویان بێت) و ئەو خەلیفە بەرێزانە لە دڵەخورپەی فەوتانی قورئان کەوتن‌و صحابەش کە هەستیان ئەکرد قورئان بە گشتی و بە نووسراوی و تەواوی هەیە بەو شێوەیەی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) لە خواوە بۆی هاتووە، بێخەم بوون‌و لە ئاسوودەییدا ئەژیان.

## ٣. قۆناغی سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففان (رەزای خوای لیٚ بێت)

قورئان هیچ ترسێکی لەسەر نەمابوو بە کۆکردنەوەی لە لایەن حەزرەتی ئەبوبەکرەوە، حەزرەتی عومەریش یاسایەکی دەرهێنابوو کە کورتەکەی ئەمەیە "رێگە بە هیچ گەورە صەحابییەکی کۆچکەر نادریٚ مەدینە جێبهێڵیٚ‌و بچێتە ولاتێکی تر بە پرس نەبێت‌و بۆ کاتێکی دیاری کراویش نەبیٚ".[1] کە حەزرەتی عومەر کۆچی دوایی کرد و فتوحاتی ئیسلامی تا دەهات زیادی ئەکرد، پێویست بوو کە گەورە صەحابییەکانیش بچن بە وڵاتاندا بۆ فێرکردن‌و پەروەردەکردنی خەڵك، ئەوەبوو هەر صەحابەی کەوتنە ولاتێك و خەڵکی ئەو ولاتانە بە پێی شێوزای ئەو صحابەیە قورئانیان ئەخوێندو خوێندنەوەکانیش لە هەندیٚ (شوێندا) جیاوازیان هەبوو، دیمەشقییەکان بە پێی خوێندنەوەی (میقدادی کوڕی ئەسوەد) و خەڵکی کوفە بە پێی خوێندنەوەی (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود) و خەڵکی بەسرە بە پێی خوێندنەوەی (ئەبو موسای ئەشعەری) و زۆرێك لە خەڵکی شامیش بە پێی خوێندنەوەی (ئوبەی کوڕی کەعب)، قورئانەکانیان ئەخوێندەوەو لەبەرئەوەی قورئانیش بە حەوت جۆر

[1] علوم القرآن، أحمد عادل كمال، ص٤٩.

خوێندنەوە ئەتوانرا بخوێنرێتەوە جیاوازییەکی زۆر کەوتە ناو موسڵمانان و بوویە کێشەیەکی گەورە.. بۆ نموونە:

- بە پێی ئیعراب وشەیەك جارێ بە "مرفوع"و جارێك بە "منصوب"ی ئەخوێنرایەوە وەك: (**فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ**)، وشەی (**آدَمُ**) لە یەکەمدا (فاعله)و لە دووەمدا (مفعول به)یە.

- بەپێی پێش‌و پاش خستنی هەندێ وشە وەك (فیقتلون ویقتلون) بە دوو شێوە ئەخوێنرایەوەو ئەمیان پێش ئەویان ئەخراو ئەویان پێش ئەمیان ئەخراو بەوشێوەیەش دوو مانای بۆ دروست ئەبوو، "**ويُقْتَلُون فَيَقْتُلُون**" یانی: کە خۆیان ئەکوژرێن‌و راستەوخۆ ئەبنە هۆی کوشتنی خەڵکی تر، ماناکەی تریان "**فَيَقْتُلُون ويُقْتَلون**" خەڵك ئەکوژن‌و خۆشیان ئەکوژرێن.

- بە پێی صیغەکانی (تاك)و (جووت)و (کۆ) ئەخوێنرێتەوە وەك (أمانتهم) کە بە (أماناتهم)یش ئەخوێنرێتەوە.

بەهەرحاڵ ئەم خوێندنەوە جیاوازانە لە هەندێ شوێندا بوویە مایەی موناقەشەو رەخنە لە یەکتری گرتن‌و ئەم ئەیوت خوێندنەوەکەی من راستەو ئەو ئەیوت خوێندنەوەکەی من لە هی تۆ چاکترەو ئەمەش وای ئەخواست کە چارەسەرێکی بۆ بکرێ.

بە پێی ریوایەتە مێژووییەکان دوو رووداو زیاتر فشاری خستە سەر موسڵمانان کە چارەسەرێك بۆ کێشەکە بدۆزنەوە.

رووداوی یەکەم: (**طبری**) ئەڵێت: "لە کاتی خیلافەتی عوسماندا مامۆستایەك بەپێی خوێندنەوەی یەکێك قوتابییەکانی فێر دەکردو مامۆستایەکی تر بەپێی خوێندنەوەیەکی تر، کە ئەم قوتابییانە ئەگەیشتنە یەکتری ئەبوویە موناقەشەیان‌و ئەم موناقەشەیەش بەرز ئەبوویەوە بۆ مامۆستاکان.[1] ئەمە گەیشتە عوسمان‌و ئەویش چوویە سەردوانگەو وتارێکی دا

---

[1] "ئەیوب" کە یەکێکە لە (راوی)یەکانی ئەم ریوایەتە ئەڵێ: وام بیستووە کە هەندێکیان نکوڵییان لە خوێندنەوەی ئەوی تر ئەکرد.. هەندێ کەسی نیاز خراپ هەیە.. ئەڵێن: "هەندێ ئەوی تریان بەکافر ئەزانی" ریوایەتەکە واناڵێ، بەڵکو ئەڵێ: "حتى كفر بعضهم بقراءة البعض". واتە نکوڵی کردن لە خوێندنەوەی ئەو و حساب نەکردن بۆی". ئیتر کوا بڵێ: (كفر بعضهم بعضا) بۆ نموونە.

بۆ موسڵمانانو فەرمووی: "ئێوە لەم نزیکانەی مندا وا جیاوازنو هەریەکەی بەشێوەیەك ئەیخوێنن، ئەی ئەبێ ئەو خەڵکە دوورە دەستە چەندێك جیاوازییان زۆرو توند بێت، ئەی هاوەڵەکانی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) تکایە کۆببنەوەو با (پێشەوا)یەك بۆ هەموو خەڵکی بنووسین".[1]

ریوایەتی دووەم: ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێت) ئەڵێت: (حوزەیفەی کوڕی یەمان) کە بەشداریی فەتحی (ئەرمینیا)ی کرد کە هەردو وسوپای عێراقو شام تێیدا بەشداربوون، (حوزەیفە) خوێندنەوەی هەردوولا ترساندی و خۆی گەیاندە عوسمانو عەرزی کرد، ئەی ئەمیری ئیمانداران! فریای ئەم ئوممەتە بکەوە تا وەك "یهودو نصاری" جیاوازییان لە پەیامەکەی خوادا بۆ دروست نەبووە، عوسمانیش خێرا ناردی بۆ لای (حەفصە)و داوای کرد ئەو (مصحف)ەی کە لایەتی بۆمی بنێرێ با چەند (مصحف)ێکی تری لەبەر بگرینەوەو پاشان ئەینێرینەوە بۆی، حەفصەش ناردی بۆیانو عوسمانیش فەرمانی کردە کە (زیدی کوڕی پابت) و (عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر)و (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)و (عەبدورەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشام) دەست بە نووسینەوە بکەن و پێی فەرموون: لەهەر ئایەتێکدا جیاوازی کەوتە نێوانتان لەسەر چۆنیەتی نووسینەکە ئەوە بڕیار بدەن بە زمانی قورەیش بینووسنەوە، چونکە ئەم قورئانە بە زمانی ئەوان دابەزیوە، ئەوانیش وایان کرد..".[2]

بە پێی ریوایەتە مێژوویەکان کە درێژەی ئەو باسو خواستانەیان هێناوە حەزرەتی عوسمان (رەزای خوای لێ بێت) دوای ئەم دوو رووداوە راوێژ بە هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەکات لە هەموو توێژەکانیان چ موهاجیریو چ ئەنصاری (کۆمەڵێك لە گەورە پیاوانی صەحابە و گەورە پێشەوایانو زانایانی ناو صەحابە کە لە سەرووی هەموویانەوە حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو، عوسمان (خوای لێ رازی بێت) ئەم کێشەیە ئەخاتە بەردەم نوخبەی ئەم ئوممەتە ئیسلامییەو ئەوانیش و ئەمیش لێکۆڵینەوەی باش ئەکەن لەسەریو هەریەکەی رای خۆی دەرئەبڕێتو ئەم رای ئەوانو ئەوان رای ئەمیان بۆ دەرئەکەوێتو عوسمان (را)ی ئەوە ئەدات کە (ـ مصحف ـ ێکی ئیمام) بۆ

---

[1] مباحث في علوم القرآن، مناع القطان، ص١٢٥. لە تەفسیری (طبري) جوزئی یەك، ص٦١و ٦٢، وەری گرتووە.
[2] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

خەڵکی بنووسرێ‌و پاش ئەم راوێژە ئەوان رازیبوونی خۆیان بۆ رایەکە دەرئەبڕن‌و ئەڵێن: **"نعم ما رأيت"!** بەراستی ئەمە باشترین رایە".[١]

دوای ئەوە عوسمان لیژنەیەکی (دوازدە کەسی)[٢] دانا بۆ ئەم ئیشە کە چوار قورئان خوێنە ناودارەکەی تێدابوو **"زەیدی کوڕی ثابت، عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر، سەعدی کوڕی عاص‌و عەبدوڕەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشام".**

ریوایەتەکە ئەڵێ: **"ئوبەی کوڕی کەعب‌و موصعەبی کوڕی سەعدو مالیکی کوڕی ئەبی عامیرو کەثیری کوڕی مفلح‌و ئەنەسی کوڕی مالیك‌و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش لەو لیژنەیدا** هەبوون، وەك لە **"إرشاد الساري، ٧/٤٤٩)دا** هاتووە.

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە عوسمان لە درێژەی راوێژەکانیدا (پرسی: کێ لە هەموو کەس نووسەرترە، وتیان: زەیدی کوڕی **ثابت** ـ نووسەرەکەی پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** ـ پرسی کێ زۆر عەرەبیزانە؟ وتیان: سەعدی کوڕی عاص، عوسمان فەرمووی: دەی با سەعد (قورئانەکە) بخوێنێتەوەو زەیدیش بینووسێت)[٣]...

ئەبو سەعید ـ هانئی دیمەشقی کە مەولای عوسمانی کوڕی عەففان بوو ـ ئەڵێت: **"كنت عند عثمان وهم يعرضون المصاحف، فأرسلني بكتف شاة الى أُبي ابن كعب فيها (لم يتسنّ) و (فأمهل الكافرين) و (لا تبديل للحلق) قال: فدعا بدواة فما احدى اللامين وكتب (لا تبديل لخلق الله) ومحا (فأمهل) وكتب (فمهل الكافرين) و كتب (لم يتسنه) ألحق فيها الهاء).**[٤] بە پێی ئەم ریوایەتە بێت حەزرەتی عوسمان ئەم ئەبوسەعیدەی بۆ ئەوە داناوە لە نێوان خۆی‌و لیژنەکەدا تا رێنووسی قوڕەیش لە نووسینەوەی قورئاندا رەچاو بکەن بۆ هەر وشەیەك کە یەك را نین لە نووسینەکەیدا.

ریوایەتەکەی ئیمامی بوخاری ئەفەرموێت: **(حتى اذا نسخوا الصحف في المصاحف ردّ عثمان الصحف الى حفصة وأرسل الى كل افق بمصحف مما نسخوا وامر بما سواه من القرآن في كل صحيفة أو مصحف أن يحرق).**[٥] واتە: کە صوحوفەکانیان هەموو لە چەند ــ

---

[1] عثمان بن عفان الصلابي، ٢٥١ء ٢٥٢.

[2] عثمان بن عفان، صادق عرجون، ص١٧١، ریوایەتەکە هی ئەبوداودی حەدیسزانە (إرشاد الساري، ٧/٤٤٩).

[3] إرشاد الساري، ٧/٤٤٩.

[4] جامع البيان، الطبري، (٣/٣٨).

[5] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

مصحف ــ ێکدا نووسیەوە، عوسمان (صوحوفەکانی) ناردەوەو بۆ لای حەفصەو هەر ــ مصحف ــ ێکی لەو ــ مصحفانە ــ نارد بە وڵاتێکداو فەرمانی دا کە جگە لەو ــ قورئان ــ ە هەرکەس صوحوفی تر یان ــ مصحف ــ ی تری لا هەیە با بیسووتێنێت).[1]

ـ ژمارەی ئەو ــ مصحف ــ انەی کە حەزرەتی عوسمان لەبەر ــ مصحف ــ ەکەی حەزرەتی ئەبوبەکر نووسیەوە..

زانایان بۆ ژمارەی ئەو قورئانانەی عوسمان لەبەر قورئانەکەی لای خاتوو حەفصە گرتییەوە چەند رایەکیان هەیە، هەندێ ئەفەرموون: چوار قورئانی لەبەر گرتەوە ــ کە ئەمەیان رای زۆربەی زانایانی لەسەرە، هەندێ ئەفەرموون: پێنج قورئانو هەندی ئەفەرموون شەشو هەندێ حەوتو هەندێ هەشت.. بۆ چوارەکە ئەفەرموون: دانەیەکیان لە مەدینە گل دایەوەو دانەیەکیان نارد بۆ شامو دانەیەك بۆ کوفەو دانەیەك بۆ بەصرە، بۆ پێنجەکە ئەو چوارەی پێشوو، دانەیەکیش بۆ ــ مەککە ــو بۆ شەشەکەش ئەو پێنجەی پێشوو لەگەڵ شەشەمێك کە هەندێ ئەفەرموون بۆ بەحرەین نێردراوەو هەندێك ئەفەرموون دانەیەکی تایبەت بە حەزرەتی عوسمان خۆی بووەو بۆ حەوتەمیش ئەو شەشەو دانەیەکی (یەمەن)یش و بۆ هەشتەمین ئەڵێن: ئەو حەوتەی پێشووی وڵاتانو دانەیەکی تایبەتیش کە عوسمان خۆی تێیدا ئەیخوێندو هەر بەسەر ئەو قورئانەشەوە شەهیدا کرا.[2]

حەزرەتی عوسمان هەر قورئانێکی ئەنارد بۆ ئەو وڵاتە کەسێکی شارەزاشی لەگەڵدا ئەنارد بۆ ئەوەی خەڵکی فێری چۆنێتی خوێندنەوەکەی بکاتو بۆیان روون بکاتەوە چەند گریمان هەڵدەگرێ بۆ خوێندنەوە.. بۆ نموونە عەبدوڵڵای کوڕی سائیبی لەگەڵ قورئانەکەی مەککەدا ناردو موغیرەی کوڕی شهابی لەگەڵ قورئانەکەی شامدا ناردو ئەبوعەبدوڕەحمانی سولەمی لەگەڵ قورئانەکەی کوفەدا ناردو عامری کوڕی قەیسی لەگەڵ قورئانەکەی بەسرەدا

---

[1] ئیبن حەجەر لە (فتح الباري: ١٨/٩)دا لە راڤەی ئەم فەرمودەیەدا و لە ماناکردنی (أن يحرق)ەدا ئەفەرموێت: لە زۆربەی ریوایەتەکاندا ئەفەرموێ: (أن يخرق) واتە پیتی (ح)ەکە نوختەی هەیە، و ئەوەشیان چەسپاوترەو (خەرقی) کتێب یان جلو بەرگ بریتییە لە دراندنو لەتوکوت کردنی.. واتە: فەرمانی دا کە هەموو ئەو ــ صحف ــو ــ مصحف ــ انەی تر بدڕێننو لەتوکوتی بکرێن، دیارە لەتوکوت کراوە و پاشان سووتێنراوە.

[2] أضواء البيان في تأريخ القرآن، صابر أبو سليمان، ص٧٧.

ناردو فەرمانی بە (زەیدی کوڕی ثابت) یش کرد کە لە رووی قورئانەکەی مەدینەوە قورئان بەخەڵك بڵێتەوە.[1]

هەندێ شت لێرەدا هەیە خەڵکی ناحەز وەك برینێك سەیری دەکەنو بەسەریەوە ئەنیشنەوە:

١ـ ئەڵێن عوسمان قورئان سوتێنەو کارێکی خراپی کردووە.

٢ـ ئەڵێن عەلیو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ـ مصحف ـ ی تایبەتی خۆیان هەبووەو دانیان بە ـ مصحف ـ ەکەی عوسماندا نەناوە.

٣ـ ئەڵێن کاتی خۆشی ئەبوبەکرو عومەر بە ئارەزووی خۆیان ئایەتو سورەتیان زیاد کردووە بۆ قورئان.

لە وەڵامدا ئەڵێین:

ـ خوای گەورە کە قورئانی ناردووە بۆ پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) هەر خۆشی ئەفەرموێت: (**إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ**) (**الحجر: ٩**). واتە: بە دڵنیاییەوە ئێمە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە و بە دڵنیایشەوە هەر خۆمان پارێزگاری ئەبین، دە کە خوای گەورە وەها وەعدێك بدات بەبێگومان هەلومەرجیشی بۆ ئەرەخسێنێ وەك:

* عەشقو خۆشەویستی ئەخاتە دڵی خەڵك کە لە هەموو لایەکەوە بکۆشن بۆ ئەوەی لەبەری بکەن و لە سنگیاندا بیپارێزن.

* هەیبەتو سامی ئەخاتە دڵان کە بێ دەست نوێژ دەستی بۆ نەبەن، سوێندی ناهەقی پێ نەخۆنو بەوپەڕی رێزەوە ناوی بەرن.

* بکۆشن بۆ ئەوەی هەرچی ئاوازی جوان هەیە بیخەنە خزمەتی قورئان تا هەمیشە لەسەر زمانی خەڵکی بێت، ئەوەتا عێراقییەکان بە ئاوازێكو میصرییەکان بە ئاوازێكو سعودییەکان بە ئاوازێكو وڵاتانی رۆژئاوای عەرەبی بە ئاوازێك و هەتا دونیا دونیایە قورئان بەردەوام لە دڵو مێشكو سنگەکاندا حزوری هەیەو مایەی شانازیو پشووی دەرونیشەو لە چاپخانەو بەردەستی نووسەرانیشدا بە هەمان شێوە حزوری هەیەو خزمەتی دێڕو لاپەڕەو رازاندنەوەی پەڕەکانی ئەکرێت، کە ئەوانە هەموو تەنیا عیشق و هیدایەتێکی خواییەو هیچی تر.

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ـ خوای گەورە پاراستنی کتێبەکانی تری پێغەمبەرانی پێشووی سپارد بە خەڵکەکە خۆی بە تایبەتی زاناکانیان، ئەوەبوو ئەوان نەیانتوانی بیپارێزنو خەڵکی لەبەر (کەمدینی) یان یان لەبەر (نەفامی)یان پڕیان کرد لە ئەفسانەو قسەی نارەواو لادان، وەك ئەفەرموێ:(َمِنَ الَّذِينَ هِادُواْ سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّاعُونَ لِقَوْمٍ آخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِن بَعْدِ مَوَاضِعِهِ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَـذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُواْ وَمَن يُرِدِ اللّهُ فِتْنَتَهُ فَلَن تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللّهِ شَيْئاً أُوْلَـئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدِ اللّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ * سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ فَإِن جَآؤُوكَ فَاحْكُم بَيْنَهُم أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْئاً وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُم بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ) (المائدة : ٤١ـ ٤٢). پاش یەك دوو ئایەتی تر ئەفەرموێت: (لِلَّذِينَ هَادُواْ وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَابِ اللّهِ وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهَدَاء) (المائدة: ٤٤). واتە: ئەی پێغەمبەری خوا بەوە دڵگران مەبە کە لەناو جولەکەکانیشدا هەن هەمیشە گوێ بۆ درۆو دەلەسە ئەگرنو بەردەوام گوێیان شلکردووە بۆ خەڵکانێکی تر کە هێشتا نەهاتوونەتە لاتو خەریکی لادانو گۆڕینی قسەنو لە مەبەستی خۆی لای ئەدەن، ئەڵێن: (ئەگەر چوونە لای موحەممەدو ئاوەهاو ئاوەها بڕیاری بۆ دان ئەوە لێی وەربگرنو ئەگەر واشی پێنەوتن ئەوە خۆتانی لێ بپارێزن،[1] جا ئەگەر خوا بیەوێ سەر لەیەکێ بشێوێنێ ئەوە تۆ ناتوانی هیچ شتێکی بۆ پەیدا بکەی لە رووی خوادا، ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا نایەوێ دڵیان پاڵفتە ببێت، لە دونیا هەر سەرشۆڕییان بۆ ئەمێنێتەوەو لە ئاخیرەتیشدا سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە، زۆر زۆر گوێ ئەگرن بۆ درۆو دەلەسەو بەردەوام خەریکی ماڵی حەرام خواردنن (کە بەرتیلو سووخواردن خووی هەمیشەییانە)... پاش ئەوە ئەفەرموێ: "ئەو جولەکانەو پیاوە خواناسەکانیان و زاناکانیان ئەرکی سەرشانیان بوو کە کتێبی خوا بپارێزنو لەسەر ئەوەش شایەت بوون... " بەهەر حاڵ شوێنی مەبەستمان لە ئایەتەکەدا وشەی

---

[1] زانایان ئەڵێن:"ئەوە گەمەیەکە لە گەمەکانی جولەکە بە تەورات، ئەگەر دەوڵەمەندێك لەناویاندا خراپەیەکی بکردایە و حوکمەکەی لە تەوراتدا قورس بوایە، ئەحبارەکانیان بەرتیلێکی باشیان وەرئەگرتو ئەیانوت: بڕۆ بۆ لای موحەممەد جا ئەگەر حوکمێکی بەم شێوەیە (شتێکیان ئەوت) سوکی پێ وتی ئەوە لێی وەربگرەو شوێنی بکەوەو ئەگەر واشی نەکرد ئەوە لێی دووربکەوەرەوەو ئاگاداربە لێی". (ص١١٤، المفردات، محمد الحمصی). تەفسیری ئەو ئایەتەی سەرەوە.

(**اسْتُحْفِظُواْ**)[1]ە کە مانای ئەوەیە داوایان لێ کراوە خۆیان کتێبەکەیان بپارێزن، کەچی ئەوان نەیانتوانی بیپارێزنو پڕبوو لە (لادان)و (قسەی خولقاو)... بەڵام خوای گەورە ئەرکی پاراستنی (قورئان)ی نەخستۆتە سەرشانی (صحابە)، یان جگە لەوان، بەڵکو ئەفەرموێ: (ئێمە خۆمان ئەیپارێزین)، کە خوای گەورەش وادەی وابدات ئیتر سروشتییە هەرچی کەرەسە هەیە بۆی فەراهەم بهێنێ.. ئێمە لە پێشەوە چەند شتێکمان وت با بە کورتی ریزبەندییان بکەینەوە:

١ـ خوای گەورە سنگی پێغەمبەری (**صلى الله عليه وآله وسلم**) سازو ئامادەکرد کە ئەم قورئانەی تێدا نەخش ببێت وەك نەخش لەسەر بەردێکی مویارەك.

٢ـ خوای گەورە بەردەوام جوبەرئیلی ئەنارد بۆ ئەوەی (مودارەسە)ی قورئان بکات لەگەڵ پێغەمبەردا .

٣ـ پێغەمبەریش (**صلى الله عليه وآله وسلم**) بەسەر ئەصحابەکانیدا ئەیخوێندەوەو پێی لەبەر ئەکردنو بەدواداچوونی ئەکردو زۆر هانی ئەدان کە زۆر زۆر ئەم قورئانە بخوێنن، جوان بیخوێننەوە، بە خەڵکی بڵێنەوە، کاری پێ بکەن، زۆری لەبەر بکەن...ئەوەتا دەیان و بگرە لە سەدان فەرمودەدا عەشقی ئەم قورئانە لە دڵاندا ئەچێنێ.. بۆ نموونە ئەفەرموێ:

ـ خوا فەرموویەتی: "**من شغله القرآن وذكرى عن مسألتي أعطيته أفضل ما اعطي السائلين**". واتە: هەرکەس قورئان و یادی من سەرقاڵی بکاتو نەیپەرژێ داوای شتم لێ بکات لەوانە شتی چاکتری ئەدەمێ کە داوام لێدەکەن.

ـ پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەفەرموێ: "**إن الله يرفع بهذا الكتاب أقواما ويضع به آخرين" رواه مسلم.** واتە: خوای گەورە بە هۆی ئەم قورئانەوە چەندان میللەت هەیە بەرزو بە حورمەتیان ئەکاتو هەر بە هۆی ئەم قورئانەشەوە چەندان میللەت سوكو بێ حورمەت ئەکات.

ـ پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەفەرموێ: "**خيركم من تعلم للقرآن وعلمه". رواه البخاري.**

---

[1] لە زمانی عەرەبیدا هەر وشەیەك (ئەلفو سینو تائی) بچێتە سەر مانای (طلب) ی تێدا دروست ئەبێ، وەك (أستغفر الله)، یان (استودع الله)، یان (استكسى) سەیری (المنجد، المقدمە)، بابەتی (استفعل) بکە.

ـ پێغەمبەر (صلی اللّٰه علیه وآله وسلم) ئەفەرموێ: **"الذي يقرأ القرآن وهو ماهر به مع السفرة الكرام البررة، والذي يقرأ القرآن ويتتعتع فيه وهو عليه شاق له أجران" متفق عليه.**

ـ پێغەمبەر (صلی اللّٰه علیه وآله وسلم) ئەفەرموێ: **"من قرأ حرفا من كتاب الله فله حسنة، والحسنة بعشر أمثالها لا أقول (الم) حرف، ولكن (الف) حرف، و(لام) حرف و(ميم) حرف". رواه الترميذي.**

ـ پێغەمبەر (صلی اللّٰه علیه وآله وسلم) ئەفەرموێ: **"إن الذي ليس في جوفه شيء من القرآن كالبيت الخرب" الترمذي.**

ـ پێغەمبەر (صلی اللّٰه علیه وآله وسلم) ئەفەرموێ: **"من قرأ القرآن وعمل بما فيه، البس الله والديه تاجا يوم القيامة ضوءه أحسن من ضوء الشمس في بيوت الدنيا فما ظنكم بالذي عمل بهذا"[1]. رواه أبوداود.**

ـ پێغەمبەر (صلی اللّٰه علیه وآله وسلم) ئەفەرموێ: **"ماأذن لنبي حسن الصوت يتغنى بالقرآن يجهربه" متفق عليه.**

ـ مەدحی ئەبوموسای ئەشعەری دەکات کە بە دەنگێکی خۆش قورئان ئەخوێنێو ئەفەرموێ: **"لقد أوتيت مزمارا من مزامير آل داود" متفق عليه.**

هەموو ئەو فەرمودانەی رابوورد لە کتێبی (**رياض الصالحين**)ی ئیمامی نەوەوی وەرگیراونو هەموو فەرموودەی "صحيح"، یان "حسن"ن. جگە فەرمودەی یەکەمیان نەبێت کە لە کتێبی (**المدخل الى فقه القرآن، فرج توفيق**) وەرگیراوەو ئەو دەڵێ: تەرمیزی ریوایەتی کردووە و "ژەهەبی" دەڵێ: (حسن)ە، بەڵام (**قسطلاني**)[2] ئەفەرموێ ریوایەتەکە ئەفەرموێ: (**من شغله القرآن عن ذكري وعن مسألتي..**). بەڵێ، ئەو فەرمودانە وای کرد صحابە بەدڵو بە گیان بکەونە قورئان لەبەرکردنو قورئان نووسینەوەو خۆیەکلاکردنەوە بۆ دیراسەکردنی و خۆبەختکردن لە پێناویدا.

٤ـ باسی ئەوەشمان کرد لە سەردەمی پێغەمبەردا هەموو قورئان لەبەرکراو هەمووشی نووسرایەوە، بەڵام بەپەرشو بڵاویو هەریەکەی ئەوەندەی بۆی لوا بوو لەلای هەبوو.

---

[1] التبيان، النووى، پەراوێزی تفسير الجلالين. ص٥٠٤.

[2] ارشاد الساري، القسطلاني، (٤٦٧/٧).

**٥ـ** باسی ئەوەشمان کرد کە عەرەب بەوە بەناوبانگ بوون کە ئەهلی ئەدەبو رەوانبێژیو شت لەبەرکردن بوونو قەسیدەی هەزار بەتییان لەبەرکردووە، بۆیە ئاسانبووە هەموو قورئان لەبەر بکەن وەك ئێستا ئاسانە ئەوەش وەعدەی خوایەو ئەفەرموێ: **(وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ)** (القمر: ١٧) ئێمە بە دڵنیاییەوە ئەم قورئانەمان ئاسانکردووە بۆ ئەوەی یادبگیرێ، ئایا هەیە بە یادی خۆی بخاتەوە.

**٦ـ** باسی ئەوەشمان کرد کە ئەصحابی پێغەمبەر **(صلی الله علیه وآله وسلم)** لەبەرئەوەی دەیانو بگرە سەدانیان هەبووە قورئانی لەبەر بووە، بۆیە بیریان لای ئەوە نەبووە کە قورئان بنوسنەوە، بەڵام رووداوێکی کتوپڕو راچڵەکێنەر روویدا گەورە صەحابەکانی خستە خولیای ئەوەی کە بیر لە کۆکردنەوەی هەموو قورئان بکەنەوە بۆ ئەوەی لە نەفەوتان و گومنەبوونی هەندێکی دڵنیا بنو دڵەڕاوکەو خەمیان نەمێنێ، ئەوەش هەر لەبەرئەوەیە خوای گەورە بەکاری هێناون تا وادەکەی خۆی پێیان بێنێتە دی **"وإنا له لحافظون"**.

**٧ـ** ئەبوبەکریشو عومەریش ئەو کارەیان بە نهێنی نەکردووەو بەراوێژو لە رووی مەنهەجێکی زانستی زۆر ووردەوە ئەنجام داوە:

ـ موناقەشەیەکی وردی کراوە لە لایەن ئەبوبەکرو عومەرەوەو چەندجار موراجەعەو دووبارە کراوەتەوەو لەوە ترساون ئەوە (بیدعە) بێت بۆیە ئەبوبەکر ئەفەرموێ: **"کیف تفعل شیئا لم یفعله رسول الله "**، عومەریش هەر ئەوەندەی ئەزانی ئەیفەرموو: **"هذا والله خیر"**، لە ریوایەتێکی تردا ئەفەرموێ: **"أنه والله خیر ومصلحة للمسلمین"**..[1] جا ئیتر ئەم زیادە ــ صحیح ــ بێت یان نا، خۆ وشەی (خیر)ەکە ئەو ماناشی تێدایە..

ـ لیژنەیەکی پسپۆڕ لەناو صحابەکاندا ئەو کارە دەکەنو مەرجی وەرگرتنیشیان ئەوەیە کە دووشایەت هەبێت بۆ هەر صەحیفەیەك کە دێتە بەردەستی لیژنەکە:

١ـ ئەبێ یەکێك هەبێت لەبەری بێت.

٢ـ ئەبێ یەکێك بە نووسراوی لای هەبێت.

ـ هەبووە پارچەیەکی لابووە، بەڵام یەکێك لە وشەکانی قورئان نەبووە، بەڵکو یان شەرحی خۆی بووە لەسەری یان جۆرێك خوێندنەوە بووە، یان مانایە کبووە بۆ وشەیەك وەك:

---

[1] عثمان بن عفان، الصلابي، ص٢٤٧.

له مصحفه‌كه‌ی ئیبن مه‌سعوددا له جیاتی بلّیّ (كالعهن المنفوش) ئه‌یخوێندنه‌وه (كالصوف المنفوش)[1]، به‌لاّم ئه‌وه خوێندنه‌وه‌ی مانابوو نه‌ك له‌فز بۆیه وه‌رنه‌گیرا وه‌ك چۆن خوێندنه‌وه (**شاذ**)ه‌كانی تریش وه‌رنه‌گیران بۆ نموونه خوێندنه‌وه‌كه‌ی ئیبن عباس بۆ ئایه‌تی (**٧٩**) سوره‌تی (الكهف) كه ئه‌یوت: ئه‌م ئایه‌ته (**وَكَانَ وَرَاءهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْباً**) (**الكهف: ٧٩**). ئاوه‌هایه (**وكان أمامهم ملك ياخذ كل سفينة صالحة غصبا**"، كه‌چی جمهوری صه‌حابه وایان نه‌ئه‌خوێنده‌وه‌و ئه‌ویش هاته سه‌ر رایه‌كه‌ی ئه‌وان.

- هه‌ندیّ ریوایات ئه‌لّێت بۆ بوونی (واو)ێك ده‌ستیان له نووسینه‌وه‌ی ئایه‌تی (١٠٠) له سوره‌تی (التوبه) هه‌لّگرت[2] تا له كاتی (حج)دا له هه‌موو موسلّمانان بپرسن بزانن ئایا خه‌لّكی ئه‌و ئایه‌ته‌یان چۆن له‌سه‌ر كردووه به (واو)ه‌كه‌وه یان به‌بیّ (واو)ه‌كه.. ئایه‌ته‌كه‌ش ئه‌فه‌رمویّ: (**وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ ..**) (**التوبة: ١٠٠**). كه مانای ئایه‌ته‌كه له‌گه‌لّ (واو)ه‌كه‌دا شتێكه‌و بیّ ئه‌و (واو)ه شتێكه، مه‌به‌ستمان (واو)ی پێش (**الذين اتبعوهم**)ه. به‌بیّ (واو)ه‌كه مانای ئایه‌ته‌كه به‌م شێوه‌یه ئه‌بێت:

كه خوای گه‌وره باسی رێزی هه‌ندیّ له خه‌لّكه‌كه‌ی لادێنشین ئه‌كات، دێته سه‌رباسی كه‌سانێكی تر كه ئه‌وان باشترو به‌رێزترن‌و ئه‌فه‌رمویّ)[3]: هه‌روه‌ها ئه‌و كه‌سانه‌ش كه له ریزی پێشكه‌وتووه یه‌كه‌مینه‌كاندان چ له موهاجیران‌و چ له ئه‌نصاره‌كان ئه‌وانه‌ی كه به‌رێكوپێكی به شوێن ئه‌واندا رۆیشتن خوا له ئه‌وان رازی بووه‌و ئه‌وانیش له خوا رازیبوون..) به‌لاّم ئه‌گه‌ر (واو)ه‌كه‌ی هه‌بێت واته (**والذين اتبعوهم**) بێت ماناكه‌ی وای لیّ دیّ: (.. هه‌روه‌ها ئه‌و كه‌سانه‌ش كه له ریزی پێشكه‌وتووه یه‌كه‌مینه‌كاندان چ له موهاجیرین‌و چ له ئه‌نصاره‌كان

---

[1] مباحث في علوم القرآن، القطان، ص١٥٢.

[2] هه‌ندیّ له زانایان ئه‌لّێن: "جاری وابوو له نووسینی ئایه‌تێكدا یه‌ك رانه‌بوون، ئه‌یانوت: پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وآله وسلم) ئه‌م ئایه‌ته‌ی به فلاّنی كوڕی فلاّن له‌به‌ركردووه ئه‌یاننارد به شوێنیدا و جاری واهه‌بوو ئه‌و كه‌سه سیّ شه‌و له مه‌دینه‌وه دور بوو، كه ئه‌هات (لیژنه‌كه) پێیان ئه‌وت: پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وآله وسلم) فلاّنه ئایه‌ت‌و فلاّنه ئایه‌تی پیّ وتووی؟ لیژنه‌كه‌ش به‌وشێوه‌یه ئه‌یانووسی كه ئه‌و ئه‌یخوێنده‌وه. أحمد عادل كمال، علوم القرآن، ص٥٥.

[3] ئه‌و زیاده‌یه كورته‌ی ئایه‌ته‌كانی پێشووه، وه‌ك دكتۆر وه‌هبه‌ت زوحه‌یلی ئه‌یلێت. (التفسير المنير، ٦/٢١).

بن‌و چ لەوانەش بن کە بە ڕێکوپێکی بەشوێن ئەواندا ڕۆیشتوون، خوا لە ئەوان ڕازییەو ئەوانیش لە خوا ڕازین..). بەو شێوەیە یەکەمجار **(الذين اتبعوهم)** بەبێ (واو) ئەبێتە **(صفه)**، یان **(عطف بيان)**، بەڵام لە دووەمجاردا ئەبێتە کۆمەڵێکی سێیەم و **(عطف)** ئەبێت لەسەر دوو کۆمەڵەکەی تر کە (مهاجرين)و (ئەنصار)ن.

ئەوەبوو ئەوانەی هاتبوون بۆ (حج) ئەوەیان دووپات کردەوە کە ئەو (واو)ە هەیەو ئەوان بە (واو)ەکەوە لە خزمەت پێغەمبەردا لەبەریان کردووە، ئەوەش بوویە پاڵپشتێك بۆ ئەوانەی کە لە لای لیژنەکە ئەیانوت بە (واو)ەوە لەبەرمان کردووە و وەك بویە پاڵپشت بۆ ئەندامانی لیژنەکە.

ـ ئەم پرۆسەی نووسینەوەی قورئانە کە بە بڕیاری (جەماعی)و بە لیژنەو بە وردەکاری‌و ئیحتیاتەکردنەوە و بەو شێنەییە کە دووساڵ زیاتری خایاند وەك ڕیوایەتەکەی پێشوومان هێناو پاشان ئەبویەکر ڕاوێژی بە صحابە کرد کامە ناو گونجاوە لەم قورئانی بنێرێت هەموو وتیان: (مصحف).

کارێکی ئاوەها جگە لە خەڵکی خراپ‌و دوو دڵ و ناحەز بە دین و دینداری، کێ هەیە گومانی بۆ ئەوە بچێت کە صحابە یان فلان‌و فیسار لە صحابە بە ئارەزووی خۆی ئایەت‌و سورەتی دانابێت، صەحابەیەك کە پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** بفەرموێ: **"من كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار".**[1] هەرکەسێك درۆیەك بەدەم منەوە بکات با شوێن بۆ خۆی لە ئاگردا چاك بکات، ئەی ئەبێ دەربارەی کەسێك پەنا بە خوا بە ناوی خواوە درۆیەك بکات چی بفەرموێ؟! پاشان با دووشتی تریش هەر بڵێین:

١ـ باشە هەر ئەو صحابانە نەبوون کە بە دڵ‌و بە گیان خۆیان فیدای ئەم قورئانە کرد، باشە هەموویان بەشدار نەبوون لەم کارە پڕ شانازییەدا، هەموو کەسێك لای خۆیەوە ئەم خەمەی هەڵنەگرت‌و پێکەوە پرۆسەکەیان نەگەیاندە ئەنجام.

٢ـ باشە خۆ هەر وشەو ڕستەو هۆنینەوەکانی ئەم قورئانە خۆی شایەتن کە کەس دەستی نەبردووە بۆ ئەم قورئانەو ئەم کتێبە هەر ئەو کتێبەیە کە خوای گەورە (تحدی)ی هەموو مرۆڤەکانی پێ ئەکات، باشە خۆ ئەم قورئانە کە ئێستا هەیەو لەبەردەستی موسڵماناندایە، ئەگەر قسەی خەڵکە بۆ کەس ناتوانێ وەك ئەو بڵێ؟ بۆ هەموو دونیا لەبەردەمیدا سەری ڕێز

[1] رواه البخاري.

دائەنەوێنیٚ‌و هەریەکەی لە گۆشەیەکەوە سەرسوڕمانی خۆی بۆی دەرئەبڕێت‌و بە شانازییەوە باسی ئەکات‌و ئەیسەلمێنیٚ کە ئەم سورەتەیان کورتەیەکە بۆ ئەوەی دوای خۆی و ئەمیان پێکەوە بەستراوەتەوە بە ئەویانەوە!.

سەبارەت بە خاڵی یەکەم‌و دووەمی ئەو گومانانەش کە ئەڵێٚ: "علی" یان "عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود" رەخنەیان بووەو بەو کارە رازی نەبوون و خاوەنی ـ مصحف ـ ی خۆیان بوون، ئەوە درۆیەکی شاخدارەو بوختانی ناحەزانەی (رۆژهەڵاتناس)و خەڵکی نادانا ئەیگوازنەوە، ئەگینا راستییەکەی ئەمەیە:

ـ راستە زۆرێك لە صەحابەی پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** ـ مصحف ـ ی تایبەتی خۆی هەبووەو چەندێك بۆی رێکەوتبیٚ قورئانی نووسیوەتەوەو هەبووە زۆری نوسیوەتەوە وەك (زەیدی کوڕی پابت)و (ئوبەی کوڕی کەعب)و (عەلی کوڕی ئەبی تالیب)و (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود)..و جگە لەوانیش هەبووە کەم‌و کەمترو بەوشێوەیە، چونکە پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** ئەیفەرموو: **"لا تكتبوا عني شيئاً سوى القرئن.."**.[1]

ـ ئەو قورئانانە شتی شخصی بوون، ناسخ‌و مەنسوخیان تێدابووە، شەرحی تێدابووە، مانای هەندیٚ وشەی تێدابووە، خوێندنەوەیەکی **(آحاد)**ی تێدا بووەو هەروەها.

ـ لەبەرئەوەش کە قورئان بە حەوت خوێندنەوە خوێنراوەتەوە و کارێکی رێگەپێدراو بووە، کەس نکوڵی لەوە نەکردووە کابرا چەند پارچە قورئانی خۆی هەبێت‌و بە یەکێکیش لەو خوێندنەوانە بیخوێنێتەوە، بەڵام کە بڕیاری ـ صحابە ـ هاتە سەر ئەوە کە هەموو قورئانەکان لەیەك ـ مصحف ـ دا کۆبکرێتەوە، چ عەبدوڵڵاو چ عەلی‌و چ غەیری ئەوانیش دایانە پاڵ کارەکەو پرۆسەکەیان سەرخست.

ـ "عەلی"یش دەربارەی کارەکەی ئەبوبەکرو دەربارەی کارەکەی عوسمانیش لە قسەی جوان بەولاوە هیچی تری بە ریوایەتی راستەقینەی مێژوو لیٚ نەگوازراوەتەوە، بەڵکو ئەفەرمویٚ: **"ياأيها الناس! لا تغلوا في عثمان، ولا تقولوا له الا خيراً، فوالله مافعل الذي فعل ـ أي في المصاحف ـ إلا عن ملأ منا، جميعا (أي: الصحابة).. والله لو وليت، لفعلت**

[1] علوم القرآن، د. محسن‌و هاوڕێکانی، ص٤٤.

**مثل الذي فعل**).[1] واته: خەڵکینە! ڕۆمەچن لە مەسەلەی عوسمانداو لەخێر بەولاوە شتێکی تر مەڵێن، سوێند بە خوا ئەوەی ئەو کردی ـ یانی دەربارەی مەصحەفەکان ـ بە دیار چاوی ئێمەوە کردی (واتە صەحابەکانەوە).. سوێند بە خوا ئەگەر منیش کاربەدەست بوومایە هەمان کاری ئەوم ئەکرد.. "نەك ئەمە، بەڵکو دەربارەی ئەبوبەکریش ئەڵێ: **"أعظم الناس أجرا في المصاحف أبوبكر، رحمة الله على أبي بكر، هو أول من جمع كلام الله"**.[2]واتە: گەورەترین پاداشت دەستی ئەبوبەکر کەوتووە سەبارەت بە مەصحەفەکان، ڕەحمەتی خوا لە ئەبوبەکر یەکەم کەسێك بوو قسەی خوای کۆکردەوە.

ـ بۆ مەسەلەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودیش کە گوایە ناڕەزایی دەربڕیوە لە کارەکەی عوسمان و ریزبەندی سورەتەکانی ئەو مەصحەفە وتوویەتی (**معوذتين**) قورئان نییە. ئەوە زانایان وەڵامی زۆریان داوتەوەو بەشێوازێکی زانستی ڕەدی ئەو گومانەیان داوەتەوەو ئێمە کورتەیەکی لێرەدا ئەنووسین.

١ـ ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێ: **"أجمع المسلمون على أن المعوذتين والفاتحة من القرآن، وان من جحد شيئا منها كفر، وما نقل عن ابن مسعود باطل ليس بصحيح"**.[3] نەك هەر ئەمە بەڵکو "ئیبن حەزم" ئەڵێ: **"هذا كذب على ابن مسعود وموضوع"**.[4] واتە: هەموو موسڵمانان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە (**معوذتين**) و (**فاتحە**) بەشێکن لە قورئان و ئەوەشی نکوڵی لە شتێکی بکات کافر ئەبێتو ئەوەش لە ئیبن مەسعودەوە ئەگێڕنەوە پووچو ناراستە.. قسەکەی ئیبن حەزمیش یانی: ئەوە درۆیە بە دەم ئیبن مەسعودەوە ئەکرێتو بوختانە بۆی هەڵدەبەستن.

٢ ـ ئیبن کەسیر لە (البدایە والنهایە، ٢١٦/٧)دا ئەڵێ: ئیبن مەسعود کە مەصحەفەکەی خۆیان لێ سەندو سوتاندیان گلەیی لێ کردنو پێی ناخۆش بوو، عوسمانیش (ڕەزای خوای لێ بێ) نامەیەکی نووسی و تێیدا بانگی ئەکات بۆ ئەوەی بەشوێن صحابەدا بڕوات کە هەموو

---

[1] فتح الباري، العسقلاني، ١٨/٩.

[2] مباحث في علوم القرآن، القطان، ص١٣٢.

[3] هەمان سەرچاوە، ص١٣١.

[4] هەمان سەرچاوە، ص١٣١.

یەکدەنگن لەسەر ئەو کارە کە بەرژەوەندییان تێدا بینیوە داوا ئەکات ئەویش یەك قسە بێتو جیاوازی دروست نەکات ئەویش یەکسەرە تۆبە ئەکاتو بریار ئەدات وەك ئەصحاب بکاتو واز لە جیاوازی و واز لە جوداخوازی بهێنێت (ڕەزای خوای لێ بێت)، نەك هەر ئەمەن، بەڵکو ئیبن مەسعود ئەڵێ: "**إن الله لاينتزع العلم إنتزاعا، ولكن ينتزعه بذهاب العلماء، وان الله لا يجمع أمة محمد على ضلالة فجامعوهم على مااجتمعوا عليه**.. ئەم قەناعەتەشی نووسی بۆ عوسمان.[1]

٣ ـ مێژووی ڕاستەقینەش ئەڵێ: "**وقد ورد أن ابن مسعود رضي تابع عثمان ولله الحمد**".[2] واتە ریوایەت هاتووە کە ئیبن مەسعود لە پاشاندا ڕازی بووەو شوێن عوسمان کەوتوەو سوپاس هەر بۆ خوایە.

٤ـ علی محمد محمد الصلابی ئەڵێ: گوێ بەوە نادرێ کە یەکێکی وەك (**طه حسین**) لە کێشەی مصحەفدا هەرچی بڵێ و قسەی ناڕەوا بگوازێتەوە دەربارەی پەیوەندی (ئیبن مەسعود) و (عوسمان)و شێوازێکی ژەهراویانە بیهێنێ، چونکە ئەو بیرو ڕاکانی لە مامۆستا ڕۆژهەڵاتناسەکانییەوە وەردەگرێت کە پشتیان بە ریوایەتی لاواز و بوختان بەستووە یان ئەو ریوایەتانەی ڕافزەکان ئەیهێنن بۆ شێواندنی پەیوەندی صەحابە بەیەکەوە، ڕەزای خوا لە هەموویان بێت. باشە ئیبن مەسعودێك کە دەست لە نوێژی (قصر) هەڵبگرێت لە (منی)دا لەترسی ئەوەی نەوەك خەڵك جیاوازی بکەوێتە ناویانو فیتنە دروست ببێتو بەشوێن خەلیفە عوسماندا ئەڕوات، ئایا ئەوەی لێ چاوەڕوان ئەکرێت کە بکاتە سەر مینبەرو خەڵك هان بداتو فێری جوداخوازیان بکات، ئەوێك کە ئەفەرموێت: "أن الخلاف شرّ، جوداخوزایی یەکپارچە شەڕە..".[3] پاشان قسەیەکی (عبدالستار الشیخ) ئەگوازێتەوە لە کتێبی (**عبدالله بن مسعود رضي الله عنه**، ص**٣٣٥**)دا ئەڵێ: مێژوونووسەکانی ڕافزە، تەزویرێکی زۆریان لە ریوایەتەکاندا کردووە و داویانەتە پاڵ (ئیبن مەسعود) سەبارەت بە پەیوەندی ئەو بە حەزرەتی عوسمانەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)، لە ڕێگەی ئەو ریوایەتە هەڵبەستراوانەوە وایان نیشان داوە کە گوایە صەحابە خەڵکێك بوون بەردەوام خەریکی پاشقول لەیەك گرتنبوونو

---

[1] عثمان بن عفان، الصلابي، ص٢٥٦.

[2] سير أعلام الانبلاء، الذهبي، (٣٤٩/١).

[3] عثمان بن عفان، الصلابي، ص٢٥٧.

رقیان لەیەکتری بووەو کەللەشەق‌و جنێو فرۆش بوون، کە بە راستی ئەو ریوایەتانە هەموو بوختانن‌و لەبەردەم لێکۆڵینەوەی هێمنانەو بابەتیانەدا خۆیان ناگرن‌و زەوقی ساغی هەموو ئیمانداریێکیش پەرچیان ئەداتەوەو پیاوی ژیریش برشوا بە شتی وا ناکات". پاشان ئەڵێ: "هەندێکیان ئەم درۆی تر ئەکات‌و بوختانێك ئەڵێ، گوایە: (ئیبن مەسعود) قسەی بە عوسمان وتووە و بە کافری زانیوە، و کە عوسمانیش بوەتە کاربەدەست ئەوەندەی لێداوە تا لە ژێر دەستییدا مردووە، دەی هەموو زانایانی مێژوو ئەوە ئەزانن کە (ئیبن مەسعود) عوسمانی بە کافرنەزانیوە، بەڵکو لە کوفەدا بەیعەتی بۆ وەرگرتووەو فەرموشێتی: "ئێمەی ئەصحابی موحەممەد (صلی الله علیه وآله وسلم) کۆبوینەوەو کەمتەرخەمییمان نەکردووە و باشترین کەسی ناو خۆمان کردوە بە خەلیفەو بەیعەتمان پێداوە، فەرمون ئێوەش بەیعەتی پێ بدەن". [1]

ئیتر دوای ئەمانە چی تر بڵێین بۆ رەتکردنەوەی ئەو گومانانەی کە پیاوی ناحەزو دەروون نەخۆش بەربادیان ئەکەن، نازانم لەناو ئەو هەمووە صەحابەشدا ئەگەر یەکێك رایەکی پێچەوانەشی بووبێ (بە گریمان) بۆ ئەبێ مانای خراپی لێدەربهێنرێ؟! ئەی بۆ نەوترێ ئەوە سەرەتا رای بووە و پاشان هاتۆتە سەر رای هاوەڵان (بۆ نموونە) یان ئەوەندەی لێ زانیوە، یان وای زانیوە بەرژەوەندی لەوەدایە، یان ئەو رایە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەو کۆمەڵگەیەدا رێگە دراوە هەموو کەس رای تایبەتی خۆی هەبێت، چی تێدایە خۆ ئەو کۆمەڵگەیە بەرەیەك نەبوون لە فریشتە، بەڵکو کۆمەڵێك مرۆڤ بوون، بەلام لە لوتکەی پیاوەتی‌و مرۆڤایەتیدا، هیچی تێدانییە یەکێ ، یان دوان‌و سیان هەڵەش بکات‌و ریزپەڕییەکی تێدا هەبێت، گرنگ ئەوەیە ئەوانە بە راستی هێمای بەرەی دینن، بۆیە خوای گەورە دەربارەیان ئەفەرموێ: "کنتم خیر أمە أخرجت للناس" (آل عمران)، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وآله وسلم) دەربارەیان ئەفەرموێ: "أصحابی کالنجوم بأیهم اقتدیتم اهتدیتم"[2]. واتە:

---

[1] هەمان سەرچاوە، ص٢٥٧.

[2] "ئیبن عەبدولبەڕ" لە کتێبی "جامع بیان العلم وفضله" ٢/٩١ دا هێناوێتی‌و هەندێ لە زانایان ئەفەرموون: "شوبهاندنی هاوەڵان بە ئەستێرەکانی ئاسمان چەند (وجه شبه)یێکی تێدایە لەوانە: ئەستێرە ئاسمان جوان ئەکەن (ولقد زینا السماء الدنیا بزینة الکواکب" ئەمانیش ئاسمانی دین ئەرازێننەوە، ئەستێرە شەیتانەکان بەردەباران ئەکەن (رجوما للشیاطین) ئەوانیش خەڵکانی شەیتان سروشت بەردەباران ئەکەن بە ژیاننامەی گەشیان، ئەستێرە هیدایەتی تێدایە "وبالنجم هم یهتدون" ئەوانیش هیدایەتیان پێوەیە ئەگەر چاویان لێ بکەی، ئەستێرە پارێزگاری

هاوەڵانی من وەك ئەستێرە وان چاو لە هەرکامیان بکەی رێت لە رێگەی هیدایەت ئەکەوێ، (عەبدوڵڵا کوڕی مەسعود)یش ئەفەرموێ: خوای گەورە سەیری دڵی هەموو بەندەکانی خۆی کرد بینی دڵی موحەممەد (**صلی الله علیه وآله وسلم**) چاکترین دڵە لە ناو بەندەکانیدا بۆیە تایبەتی کرد بە خۆیەوە و پەیامی خۆی پێدا ناردو پاش ئەوە سەیری دڵی هەموو بەندەکانی کرد دوای دڵی موحەممەد ، بینی دڵی هاوەڵەکانی چاکترین دڵن، بۆیە کردنییە وەزیری پێغەمبەرەکەی، لەسەر دین شەڕیان ئەکرد، ئەوەی موسڵمانان بە چاکی ئەبینن لای خواش چاکە، ئەوەشی ئەوان بە خراپی بزانن لای خواش خراپە).[1]

مەولەوی گەورە شاعیریش دەربارەی ـ صحابە ـ ئەفەرموێت:

ئەوانن ئەوان چاکیان بناس
(خیر أمه أخرجت للناس)
ئەدەس ئەوان کەوت دەرەجەی قبوڵ
رەزامەندی حەق، صوحبەتی رەسول
بکە بە چاوی تەماشایان
لەم قورئانەدا مەدحو ثەنایان
ئینصافت بوێ نەظەرکە وور وورد
چلۆنە شەخصێ خودا سەنای کرد
نەك هەر لە جایێ، جایەکێ، جا دوو
راس وە بێ جا دوو (جاهدوا، جادوا)
بە موجاهیدەی ئەصغەرو ئەکبەر
بە جودی مەیسور یان مەعسور یەکسەر
بە نەفس و بە ماڵ (فی سبیل الله)
(بالله، مع الله، فی الله، لله)..[2]

---

ئاسمان ئەکات "وحفظا من کل شیطان مارد" هاوەڵانیش پارێزگاری لە دین ئەکەن و نایەڵن کەس دەستی تێ بخات!! ئەمەش راستییەکە هەرکەس کەمێك بیری لێ بکاتەوە ئەیسەلمێنێ.

[1] شرح العقیدة الطحاویة، إبن أبي العز الحنفي، ص٦٩٦.

[2] **عەقیدەی مەرضیە، مەولەوی، شەرحی مەلا عەبدلکەریمی مدرس، ل٤٦٥.**

## ٤. قۆناغی سەردەمەکانی دوای عوسمان (خوای لیٚ رازی بیٚت)

وتمان حەزرەتی عوسمان لەسەر قورئانەکەی حەزرەتی ئەبوبەکر (هەشت) قورئانی نووسییەوەو ناردی بە ولاٌتاندا بۆ ئەوەی جیاوازی لە خویٚندنەوەدا نەهیٚلیٚ، هەموو موسلمانان لە هەمو ولاٌتیٚکدا ئەو قورئانە پیٚشەوایان بیٚت، بۆیە نووسەرانی میٚژوو ئەلیٚن: ئەو قورئانانە ناونراون (قورئانە پیٚشەواکان = **المصاحف الأئمة**) نووسینەوەی ئەم موصحەفانە وەك لە ریوایەتەکاندا هاتووە بە خەتیٚکی (جوانو دریژ کراوە) نووسراون.. ئیمامی بوخاری لە کتیٚبی (**التأريخ الصغير: ٩٤/١**) دا ئەلیٚ: (**وقد أدرك مصعب بن سعد صحابة النبي حين مشق عثمان (رضي الله عنه) المصاحف، فرآهم قد أعجبوا بهذا الفعل منه**".. زانایانی زمانەوانی ئەلیٚن: "**مشق في الكتابة: مدّ حروفها وأسرع فيها، ويقال: في قده مشق: أي طول مع رقه**".[١] واتە: لە نووسینەکەدا مەشقی کرد، یانی پیتەکانی دریٚژکردەوەو خیٚراش ئەینووسی، ئەوتریٚ: "**في قدّة مشق**" (بالاٌی مەشقی تیٚدایە) یانی بەرزەو باریکە. کەواتە مانای ریوایەتەکە بریتییە لە: موصعەبی کوڕی سەعد ئەو کاتەی کە عوسمان بەخەتیٚکی دریٚژو جوان[٢]مەصحەفەکانی خیٚرا نووسییەوە، گەیشتە خزمەتی صەحابە بەڕیٚزەکان بینی هەموو (موعجەبەن= سەرسامن) بەو کارە".

ئیتر ئەوەبوو دوای ئەوە لە هەر شویٚنیٚکدا قورئان بنووسرایەتەوە لەبەر ئەو قورئانانە ئەنووسرانەوەو کەس قورئانی تری لانەما، چونکە خەلیفەی موسلمانان فەرمانی (دڕاندنی، یان سوتاندن)ی هەموو مەصحەفیٚکی تری دەرکرد بوو، هەموو ئوممەتیش فەرمانەکەیان جیٚبەجیٚ کرد، هەندیٚ لە میٚژوونووسان ئەلیٚن لە کاتی شەڕی "**صفين**"دا خەلکی شام پیٚنجصەد قورئانیان بەرز کردەوە بۆ ئەوەی شەرەکە رابگیریٚت، دەی خۆ ماوەی نیٚوان نووسینەوەی قورئانو شەڕی "**صفين**" نزیکەی حەوت سالٌ بوو.[٣] کەواتە دوای ئەوە لەبەرئەو (قورئانە پیٚشەنگانە) قورئانی تر ئەنووسرایەوە و روونووسەکانی زیاد ئەکرا.

---

[1] المنجد، وشەی (مشق)، ص٧٦٣.

[2] علی الصلابي لە (عثمان بن عفان، ص٢٥٢)دا ئەلیٚ: (مشق في الكتابة: أي: مد حروفها و جوّدها، فالخط مشق وممشوق).

[3] أحمد عادل كمال، علوم القرآن، ص٦٧و ٦٨.

راستە قورئانەکانی سەردەمی عوسمان جوان نوسراونەتەوەو رۆشن بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە خاڵبەندی و سەرو بۆری نەبووە، هەندێ کەسی عەرەبی نەزان کەوتوونەتە هەڵەوە لە کاتی قورئان خوێندندا بۆیە بیر لەوە کراوەتەوە کە خاڵ بۆ پیتەکان دابنرێ.. لە کاتی حەزرەتی عوسماندا مەصحەفەکە بەو شێوەیە نووسراوە تا زیاد لە خوێندنەوەیەك هەڵبگرێ بۆ نموونە نووسراوە: "**وانظر الی العظام کیف ننسرها ثم نکسوها لحما**" هەڵی گرتووە بە "ننشزها" بخوێنرێتەوەو هەڵی گرتووە بە "ننشرها" بخوێنرێتەوە، یان "**ان جاءکم فاسق بنبا فتبینوا**" هەڵی گرتووە بە "فتبینوا" بخوێنرێتەوە، هەڵیشی گرتووە بە "**فتثبتوا**" بخوێنرێتەوە کە ماناکانیان لەیەکەوە نزیکە.. ئەم جۆرە نووسینانە لای عەرەب شتێکی سەیر نەبوو، خوێندنەوەکەشی شتێکی زەحمەت نەبوو لای ئەوان، بەڵام بۆ جگە لە عەرەب زەحمەت بوو، زۆرجار ئەکەوتنە هەڵەوە، بۆیە موسڵمانان بیریان لەوە کردەوە کە ئەو کێشەیە چارەسەر بکەن، و خاڵو سەروبۆر بۆ قورئان بکەن بۆ ئەوەی هەموو کەس بتوانێ قورئان بخوێنێتەوە بەبێ هەڵە، زانایان چەند رایەکیان هەیە دەربارەی ئەوەی ئایا یەکەم کەس کێ بیری لەمە کردوەتەوەو لەسەردەمی کێدا بووە.

ـ زۆربەی زانایان رایان وایە یەکەمین کەسێك کە بیری لەم کارە کردوەتەوە و پێی هەستاوە (ئەبوئەسوەدی دوئەلی) یە، کە پیاوێکی عەرەبیزانو زۆر خوێندەوار بووەو هەر ئەم (ئەبوئەسوەدە) بە فەرمانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بنەماو رێساکانی (زمانی عەرەبی) داناوە).[1]

زیاد کە والی (بصرە) بوو داوای کرد لە (ئەبوئەسوەدی دوئەلی) خزمەتێك بە قورئان بکاتو سەروبۆر بۆ قورئان دابنێ تا خەڵکی لە خوێندنەوەدا هەڵە نەکەن، ئەویش هەر دوای ئەخاتو کارەکە ناکات، تا رۆژێك گوێی لەکابرایەك ئەبێت ئەم ئایەتە ئەخوێنێتەوە (**إن الله بريء من المشركين ورسوله**) ئایەتەکە یانی: خوا و پێغەمبەری خوا (بەرین) لە موشریکەکان، "**رسولُهُ**" لە ئایەتەکەدا (مەرفوعە)و بۆری هەیە کەچی کابرا (**رسولِه**)ی بە "مجرور"ی خوێندەوەو ژێری دا بە لامەکە، مانای ئایەتەکە هەڵەیەکی گەورەی تێکەوت، چونکە ئەوکاتە ماناکەی وای لێ دێ: خوا "بەرییە" لە موشریکەکانو لە پێغەمبەرەکەشی!!

---

[1] القطان، مباحث في علوم القرآن، ص١٤٣، ئەبوئەسوەد یەکێکە لە (تابعینە) بەرێوەکانو لەبەصرە دا ساڵی ٦٩ی کۆچی وەفاتی کردووە.

(ئەبوئەسوەدی دوئەلی) راچڵەکی‌و وتی: "بێگەردی بۆ خوا لەوەی خۆی بەری بکات لە پێغەمبەرەکەی و بەپەلە خۆی گەیاندە "زیاد"و پێی وت: ئەو کارەی خستوتە سەرشانم رایئەپەڕێنم، هەستا دەستی کردە خاڵبەندی بۆ قورئان، بۆ (سەر= فتح) خاڵێکی لەسەر پیتەکە دادەناو بۆ (بۆر= ضم) خاڵێکی لە ناوەڕاستی پیتەکەدا دائەناو بۆ (ژێر= کسر) خاڵێکی لەژێر پیتەکەوە دائەناو بۆ (زەنە = سکون) دوو خاڵی لەسەر پیتەکە دائەنا.[١]

ئیمامی **سیوطی** ئەڵێ: یەکەمین کەس کە ئەم کارەی کرد (ئەبوئەسوەدی دوئەلی) بوو بە فەرمانی خەلیفە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان نەك بە فەرمانی (زیاد)، چونکە نزیکەی چلو ئەوەندە ساڵ خەڵك هەر لەبەر مەصحەفەکەی عوسماندا قورئانیان ئەخوێند تا هەڵەو خوێندنەوەی نادروست لە عێراقدا پەرەی سەندو کاربەدەستان بیریان لەخاڵ‌و شێوەی نووسین کردەوە.

هەندێ ریوایەتی تریش هەیە کە ئەوکارە ئەدەنە پاڵ خەڵکی تر وەك: شێخ حەسەنی بەصری، یەحیای کوڕی یەعمور، نەصری کوڕی عاصمی لەیثی،[٢] (ئەبوئەسوەدی دوئەلی) کە بەو کارە ناوبانگی دەرکردووە، لەوانەیە هەریەك لەوانە لە گۆشەیەکەوە خزمەتێکیان لە جوانکاری قورئان دا بە جۆرێك ئەنجام دابێت بۆیە لەم باسەدا ناویان دەهێنرێت.

ـ نووسینەوەی قورئان سەردەم دوای سەردەم جوانکاری‌و ئاسانکاری زیاتری بەخۆیەوە ئەبینی و وای لێ هات چەند رەنگێك بۆ نووسینی پیتەکان بەکاردەهێنرا، هەر پیتێك بە رەنگی سوور بنووسرایە بەڵگەی ئەوەبوو کە لە کاتی خوێندنەوەدا ناخوێنرێتەوە (واتە تەلەفوزی پێ ناکرێ) وەك پیتە شەمسییەکان، پاشان (خليل بن أحمد الفراهيدى) ـ زانای گەورەی عەرەبیزان‌و دانەری زانستی (کێش‌و سەراوو بەحرەکانی **عروض** و مامۆستا (**سیبویه**) ناودار، ساڵی (٧٠) کۆچی لە بەصرە وەفاتی کردوە ـ هەستا بە دانانی (سەرو بۆرو زەنەو ژێر) بەشێوازێکی تری تازە، (ژێر) (لاکێشەیەکی درێژ) لە ژێر پیتەکەداو (سەر) لاکێشەیەکی درێژ لەسەر پیتەکەداو بۆر (واوێکی بچووك) لەسەر پیتەکەو بۆ (تنوین) دوو واوی بچووك، یان دوو ژێری بچوك، یان دوو سەری بچووك‌و بەرەنگی سور هەموو ئەو

---

[1] القطان، مباحث في علوم القرآن، ص١٤٣.

[2] "نەصری لەیثي" یەکێکە لە فیقهزانەکانی تابعین‌و لە بەصرەداو لە ساڵی (٨٩) کۆچی دا وەفاتی کردووە.

پیتانەی ئەنووسی کە ناخوێنرێنەوەو تەلەفوزیان پێ ناکرێ، تەنانەت نیشانەی (ئیقلاب)و (ئیدغام)یشی بەوشێوەیە دانا".[1]

ـ پاشان سەردەمی سێیەمی کۆچی هاتە پێشەوە و نیشانەی (مدّ)و (**شدّه**)و (هەمزەی وەصل) دامەزران‌و پاش ئەوەش پلە پلە خەڵکی ناوی سورەتەکان‌و (مکی)و (مدنی)یان لەسەرەتای سورەتەکاندا بە زەخرەفە و جوانکارییەوە ئەنوسی‌و نیشانەکانی (وەقف)و وەستان لەسەر ئایەتەکانیان دانا لە رووی ماناو ئەو ریوایەتانەی لەسەریان هەبوو، دوای ئەوەش (جوزئەکان)و (حیزبەکان)و نیشانەی (سجده) و (**سكته**)و هەموو ئەوانەیان دانا.

راستە زانایان لەسەرتادا بە ترسەوە دەستیان بۆ قورئان ئەبردو نەیان ئەوێرا دەسکاری هیچ شتێکی بکەن، نەشێوازی نووسینەکەو نە هیچی تری، چونکە ئەوە قورئانە و کەلامی خوایەو ئاسان نییە خەڵکی هەروا بێ ترس دەستی بۆ بەرێت، ئەم ترسەی موسڵمانان بۆ جوانکردنی قورئان و رێکخستنی زیاتری سورەت‌و ئایەتەکانی زیاتر لە دوو شتەوە سەرچاوەی گرتبوو:

یەکەمیان: ئەو هەمووە ترس‌و حەزەرەی کە ئەبوبەکرو عومەرو صەحابەکانی تر بە خەرجیان دا لە کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئاندا، ئەوەبوو بەردەوام پرۆسەی نووسینەوەیان ئەهێناو ئەبرد و نەیانئەزانی ئەنجامی بدەن یان نا، تاکە بەڵگەی دەستیان ئەوەبوو ئەیانووت: **"إنه والله خير"**.

ئەم ترسەی صەحابە لەبەرئەوە بوو ئەترسان ئەوە بیدعەو بێ شەرعی بێت کارێك بکەن کە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) نەیکردبێت، بەڵام پاشان (بەرژەوەندی موسڵمانانیان) لەوەدا بینیوە کە ئەم قورئانە هەمووی کۆبکرێتەوەو هیچی لێ نەفەوتێ و کارەکەش بەڵێ پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) خۆی نەیکردووە، بەڵام خۆ رێگەی داوە خەڵکی بینووسنەوەو لای خۆیان هەڵی بگرن‌و بۆ خۆشی ئەو هەمووە **"**نووسەری وەحی**"** هەبووەو تەواوی ئایەتەکانی قورئانی پێ نووسیونەتەوە.

دووەمیان: قسەیەکی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود هەبوو دوای خۆی موسڵمانانی زۆر ئەترسان لەوەی دەست بۆ قورئان بەرن، قسەکە ئەفەرموێ: **"جرّدوا القرآن ولاتخلطوه**

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٤٤، هەروەها (أصول الأحكام، د. حمد الكبيسي و دكتور صبحي جميل، ص٤٣).

بشيء". قورئان لە هەمووشتێکی تر دابڕنو شتی تری تێکەڵ مەکەن. ئەمە وای کرد کە خەڵکی نەوێرن لەو رێورەسمە لابدەن کە حەزرەتی عوسمانو صحابە دایان نابوو بۆ قورئان.[1] بۆیە ماوەیەکی زۆر هەر بەو شێوازە قورئان ئەنووسرایەوەو ئەخوێنرایەوە کە نزیکەی پەنجا ساڵی خایاند.[2] بەڵام ئەوەبوو لە پاشاندا زانایان هەریەکەیان لە سەردەمی خۆیدا جۆرێك لە (خێر)ی ئەبینی لە جوانترکردنی ـ مصحف ـ داو هەندێ سەرەتادانانی خاڵیان بە (دروست) ئەزانی، چونکە لایان وابوو ئەوە دەستکاری کردنی قورئان نییە، بەڵام (پێنجیەك) کردن و (دەیەك کردن) و (ناوی سورەتەکان) و ئەو شتانەیان بە (دروست) نەئەزانی.. ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێت: "هەموو زانایان یەکدەنگن لەوەدا کە نووسینەوەی قورئان و روونکردنەوەی و دەربڕینیو لێکدانەوەی رێنووسەکەی بێ زۆر لە خۆکردنو هەڵواسینی کارێکی زۆرباشە، زانایان ئەفەرموون: شتێکی باشە (موستەحەبە) خاڵو شێوەی تایبەت بۆ قورئان دابنێی، چونکە قورئان لەوە ئەپارێزرێت کە ئاوازی هەڵەی بدەیتێ یان بە هەڵە بیخوێنیتەوە،[3] ئەو قسەیەی (شەعبی)و (نەخەعی) ئەیکەن وایە خاڵ دانان بۆ قورئان کەراهەتی هەیە، ئەوە ئەوان لە زەمانی خۆیاندا بەکەراهەتیان زانیوە لە ترسی ئەوەی نەك گۆڕانکاری لە قورئاندا دروست بکاتو ئەمڕۆ ئەو ترسە نەماوەو ئەوەش نابێتە رێگر گوایە ئەوە (بیدعە)یە، چونکە ئەوە (بیدعەیەکی حەسەنە)یەو رێگەی لێ ناگیرێ وەك چۆن رێگە لەو شتانەی تریش نەگیراوە کەلەم ئیشە ئەچن، وەك دانانی کتێب لە زانستەکاندا، یان دروستکدرنی قوتابخانەو پەیمانگاو[4] شتی تریش... والله أعلم).[5]

---

[1] بیرمە لە ساڵی ١٩٨٢دا بەڕێز مامۆستا عومەر رێشاوی کە زانایەکی خویندەوارو بە توانای ناوچەی هەڵەبجە بوو فەرمووی: مـن رام لەوەنییـە قورئـان جگـە لـەناوی سـورەتو ئایەتـەکان هیـچی تـری لەگەڵدا چاپ بکـرێ، چـونکە سەرئەکێشێ بۆ دەست بردن بۆ قورئان، دیارە هەر ئەو ترسە بوو کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود باسی لێوە ئەکات.

[2] القطان، علوم القرآن، ص١٤٣.

[3] لـەلای أحمـد عـادل کمـال نووسـراوە (صـیانة مـن اللحـن فیـە وتـصحیحە)، بـەڵام لـە (تبیـان)ەکـەدا ئـەڵێ: (.. وتصحیفە)، بۆیە ئێمە لەسەر دەقە سەرەکییەکەی رۆیشتینو ئەویانو بە هەڵەزانی.

[4] **نەوەوی وشەی** (الرباط)**ی بەکارهێناوە کە** (الرباط) کۆیەکەی (رباطات)ە، بـە مانـای (المعاهـد المبنیـة والموقوفـة للفقراء) دێت، واتە پەیمانگای دروستکراو کە تایبەتەو وەقفە بۆ هەژاران.

[5] تفسیر الجلالین، آداب حملة القرآن، النووي، ص٦٣٣.

٥ـ ئەو ئایەت و سورەتانە کامانەن کە لە مەدینەدا دابەزیون کەچی حوکمیان وەك هی (مکی)یە .

٦ـ ئەو ئایەتە "مەککی"یانە کامانەن کە لە سورەتە مەدەنییەکاندا هەن.

٧ـ ئەو ئایەتە مەدەنیانە کامانەن کە لە سورەتە مەکییەکاندا هەن.

٨ـ ئەو ئایەتە مەدەنیانە کامانەن کە لە " مەکی" ئەچن.

٩ـ ئەو ئایەتە مەککییانە کامانەن کە لە " مدنی" ئەچن.

١٠ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە مەککەوە براون بۆ مەدینە.

١١ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە مەدینەوە براون بۆ مەککە.

١٢ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە زستاندا دابەزیون.

١٣ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە هاویندا دابەزیون.

١٤ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە شەودا دابەزیون.

١٥ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە ڕۆژدا دابەزیون.

١٦ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە" سەفەردا" دابەزیون.

١٧ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە شاردا دابەزیون.

لە کتێبەکانی "علوم القرآن" دا نمونە بۆ هەریەك لەوانە هێنراوەتەوە بەپێی ریوایەتی مێژوویی.

ئەمانە چەند مەسەلەیەکی سەرەکین و تەوەرەکانی بریتییە لە باسی" مەککی" و " مدنی" و بۆ ئەم مەبەستەش ناونراوە" زانستی مەککی" و "مەدەنی" .

زانایان ئەڵێن".[1]

نزیکترین ئامارێك کە کرابێت بۆ سورەتە مەدەنی و مەککییەکان بریتییە لە :

١ـ بیست سورەت "مەدەنییە"، کە ئەمانەن (**البقرة, آل عمران, النساء, المائدة, الأنفال, التوبة, النور, الأحزاب, محمد, الفتح, الحجرات, الحديد, المجادلة, الحشر, الممتحنة, الجمعة, المنافقون, الطلاق, التحريم, النصر**).

٢ـ دوازدە سورەتیش ڕای جیاوازی لە سەرە کە ئەمانەن (الفاتحه, الرعد, الرحمن, الصف, التغابن, **التطفيف**, القدر, البينه, الزلزله, الاخلاص, الفلق, الناس ) .

---

[1] مباحث في علوم القران, مناع القطان, ص٥.

**٣ـ** ئەو سورەتانەی تر کە ئەمێننەوە, هەر هەموو سورەتی "مەککی"ین و پێش کۆچی پێغەمبەر (**صلی الله علیه وآله وسلم**) بۆ مەدینە دابەزیوون. کە ئەکاتە هەشتا و دوو سوورەت و بەو شێوەیە ژمارەی سورەتەکانی قورئان ئەکاتە:

بیست سورەت "مەدەنی". دوازدە سورەت "هەم مەککی و هەم مەدەنی". هەشتا و دوو سورەت "مەککی" و کۆی هەمووی ئەکاتە (سەد و چواردە سورەت) کە ژمارەی سورەتەکانی قورئانی پیرۆزە).

## ناسینەوەی ئایەت و سورەتەکان:

زانایان سێ پێوەر دائەنێن بۆ جیاکردنەوەی "مەککی" لە "مەدەنی".[1]

**پێوەری یەکەم:** "پێوەری کاتە" واتە: هەر ئایەت و سورەتێك پێش کۆچکردنی پێغەمبەر (**صلی الله علیه وآله وسلم**) دابەزیبێتە سەر پێغەمبەر (**صلی الله علیه وآله وسلم**) ئەوە " مەککییە" و مەرجیش نیە لە خودی مەککە خۆیدا دابەزێت و ئەگونجێ لە شار و شوێنێکی تری جگە لە مەککەدا دابەزیبێت و هەروەها هەر ئایەتێکیش لە دوای کۆچی پێغەمبەرەوە (**صلی الله علیه وآله وسلم**) دابەزیبێت پێی ئەوترێ "مەدەنی"، با لە "خودی مەدینە" شدا دانەبەزیبێت وەك ئایەتی: (**إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا**).[2]

ئەم ئایەتە لە مەککەدا و لە ناو کەعبەی پیرۆزدا و لە ساڵی "فەتحی گەورە"دا دابەزیوە, بەڵام پێی ئەوترێ: "ئایەتێکی مەدەنی". یان خوای گەورە ئەفەرموێ: (**الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينا**) (**المائدة: ٣**). ئەم ئایەتەش بە هەمان شێوە ئایەتێکی مەدەنییە با لە مەککە و لە ناو کەعبەدا و لە ڕۆژی جومعە و ئێوارەی عەرەفەدا دابەزیوە کە ساڵی "حەجیماڵئاوایی" بوو.[3]

---

[1] زانایان دوو ڕێگە باس ئەکەن بۆ زانینی "مەککی" و "مەدەنی": یەکەمیان: "ڕیوایەتی ئەصحاب و تابعینەکان". دووەمیان: "ئیجتهاد و عەقڵکاریی", بەوەی سروشتی ئایەتەکانی مەککە لە ئایەتە مەدەنیەکان دەربخەی و بزانی ئەم باسو خواستی ئایەتی "مەککی"یە، یان "مەدەنی"یە.

[2] النساء/٥٨.

[3] متاع القطان, علوم القرآن, ص٥٧.

**پێوەری دووەم:** "پێوەری شوێنە" واتە: شوێنی دابەزینەکان ئەکەنە ناو بۆ سورەت و ئایەتەکان, ئەمانەن:

ئەڵێن ـ هەر سورەت و ئایەتێك لە "مەککە" و چواردەوریدا وەك "منی"و "عرفات" و "حدیبیە"دا دابەزیبێت، ئەوە بە "مەککی" ناو دەبرێت و هەر ئایەت و سورەتێکیش لە مەدینە و چواردەوریدا وەك " ئوحد و **قوباء** و سەلع" دابەزیبێت ئەوە بە "مدنی" ناو ئەبرێت. بەڵام ئەم پێوەرە وورد نییە و چەندین ئایەت و سورەت هەیە کە ناچێتە ژێر ئەو تەقسیمەندییەوە وەك: ئەو ئایەت و سورەتانەی لە "سەفەر"دا دابەزیوون, بۆ نمونە ئایەتی: (**لَوْ كَانَ عَرَضاً قَرِيباً وَسَفَراً قَاصداً لاَّتَّبَعُوكَ..**). ئەوە لە (تبوك) دا دابەزی، هەروەها (**وَاسْأَلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَا**). لە "بيت المقدس"و لەشەوی ئیسرادا دابەزی.[1]

پاشان ئەم پێوەرە کەموکورتییەکی تریشی تێدایە ئەویش ئەوەیە چەندان ئایەتو سورەت کە لە سەردەمی مەدینەدا دابەزیوە، ئەیانکاتە (مەککی).

**پێوەری سێیەم:** "جۆری خیتابەکانە" واتە: "مەککی" ئەوەیە کە خەڵکی مەککە ئەدوێنێو "مەدەنی" ئەوەیە کە خەڵکی "مەدینە" ئەدوێنێ، ئەم زانایانە ئەڵێن هەر سورەتێك کە (**یاأیها الناس**)ی تێدا بێت ئەوە (مەککی)یە، هەر سورەتێك (**یاایها الذین آمنوا**)ی تێدا بێت ئەوە "مەدەنییە". ئەم پێوەرەش مەرج نییەو بەسەر هەموو ئایەتو سورەتەکانی قورئاندا جێبەجێ نابێت، بۆ نموونە سورەتی (البقرە) کە مەدنییە ئایەتی (**یاأیها الناس اعبدوا ربکم**)ی تێدایە و سورەتی (**الحج**)یش مەکییەو کەچی ئایەتی (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ**)یشی تێدایە.

ـ جیاوازی نێوان مەککیو مەدەنی:

زانایان هەریەکەی لە گۆشەنیگایەکەوە سەیری جیاوازی "مەککی"و "مەدەنی" ئەکەن.

ـ هەیانە لەو رووەوە سەیری ئەکەن کە (لەفز)و دەستەواژەکانیان لە یەك ناچێت.

ـ هەیانە لەو رووەوە سەیری ئەکات کە باسو خواستەکانیان لە یەك ناچێت.

بۆ نموونە ئەفەرمون:

١ـ هەر سورەتێك "سجدە"ی تێدا بێت ئەوە "مکی"یە.

---

[1] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

٢ـ هەر سورەتێك وشەی "كلا"ی تێدا بێت ئەوە "مكی"یە.[1]

٣ـ هەر سورەتێك "یابنی آدم"، یان "یاأیها الناس"ی تێدا بێت، "مكی"یەو هەموو سورەتێكیش "یاأهل الكتاب"، یان "**یاأیها الذین آمنوا**"ی تێدا بێت "مەدەنی"یە بە تەنیا سورەتی "**الحج**" نەبێت.

٤ـ هەر سورەتێك چیرۆكی تێدا بێت، چ هی پێغەمبەران بێت، یان هی میللەتە پێشووەكان بێت، ئەوە (مەككی)یە، تەنیا سورەتی "**البقرة**" نەبێت، كە مەدنییە و چیرۆكی زۆریشی تێدایە.

٥ـ هەر سورەتێك باسی ئادەمو شەیتانی تێدا بێت، "مكی"یە سورەتی "**البقرة**" نەبێت.

٦ـ هەر سورەتێك بە پیت دەست پێ بكات وەك (الم، الر، حم، ..) ئەوە "مكی"یەو تەنیا دوو سورەتی (البقره، آل عمران) نەبێت.[2]

٧ـ سورەتە مەكییەكان ئایەتەكانیان كورت كورتن.

٨ـ هەر سورەتێك وەسفی مونافیقی تێدا بێت ئەوە مەدەنییە، سورەتی "العنكبوت" نەبێت.

٩ـ سوێند خواردن یەكێكە لە نیشانەكانی سورەتە "مەككی"یەكان و نۆ سورەتی مەككی بە سوێند خوادرن دەست پێدەكەن كە ئەمانەن (**والصافات، الذاریات، والضحی، والعادیات، والعصر، والیل اذا یغشی، والشمس وضحاها، لا أقسم بیوم القیامة، لا أقسم بهذا البلد**).

ئەمە هەندێ لەو جیاوازییانەی كە لە رووی فۆرمو دەستەواژەوە مەككی لە مەدەنی جیا دەكاتەوە.

زانایان لە رووی باسو بابەتەكانیشەوە جیاوازی نێوان مەككیو مەدەنی دەكەن وەك دەفەرموون:

١ـ ئایەتە مەككییەكان زیاتر باسی عەقیدەو عیبادەتكردنی خواو سەلماندنی خودایەتی قورئانو باسی قیامەت ئەكاتو موناقەشەی بێباوەڕان ئەكات و بە بەڵگەی عەقڵی بیرورا ئاینییەكان ئەچەسپێنێت.

---

[1] زانایان ئەڵێن وشەی (كلا) تەنیا لە نیوەی دووەمی قورئان و سیو سێ جارو لە پازدە سورەتدا هاتووە.

[2] زانایان لەسەر سورەتی (الرعد)یش دوو رایان هەیە.

٢ـ ئایەتە مەككییەكان باسی بنەماكانی رەوشت ئەكەن و بناغە بۆ هەندێ (تەشریعات) دائەنێنو باسی خورەوشتی خراپی بێباوەران ئەكەن.

٣ـ ئایەتە مەككییەكان زیاتر باسی چیرۆكی پێغەمبەران و دڵخۆشی پێغەمبەر **(صلی الله علیه وآله وسلم)** ئەكات و دڵی ئەداتەوە تا ئارام بگرێتو دڵنیابێت لەوەی خوای گەورە سەركەوتنی ئەداتێ.

٤ـ هەر سورەتێك باسی فەریزەیەكی ئاینی، یان سنوور (حد)ێكی خوا بكات، سورەتێكی مەدەنییە.

٥ـ هەر سورەتێك موناقەشەی (ئەهلی كتێب) بكات سورەتێكی مەدەنییە.

٦ـ هەر سورەتێك درێژەی (یاسایەك)، یان درێژەی (عیبادەتێك)، یان باسێكی جیهادو پەیوەندییەكانی موسڵمانو نا موسڵمان بكات، یان باسی حاڵەتی شەڕ، یان ئاشتی ئەكرد، ئەوە سورەتێكی مەدەنییە.

٧ـ سورەتە مەدنییەكان چەند باسێكیان تێدایە كە لە سورەتە مەككییەكاندا نین لەوانە:

ـ ریسواكردنی دووڕووەكانو شیكاركردنی بیروبیركردنەوەو هەڵسوكەوتیان.

ـ بانگكردنی ئەهلی كیتاب بۆ لای ئیسلام، و باسكردنی لادانەكانی ناو كتێبەكانیان.

ـ بنەماو درێژەی (تەشریعاتی ئیسلامی).

ـ ئایەتە مەدەنییەكان درێژنو بە درێژی باسی شتەكان ئەكەن و هەناسەی دووریان تێدایە.

ـ باسی "ئەنصار" و "موهاجرین" و "یەهود"و "مونافقین" بە درێژی ئەكات، چونكە كۆمەڵگەی مەدەنی لەو چەند توێژە دروست بوو بوو.[١]

* سودەكانی زانینی "مەككی"و "مەدەنی"، زانایان باسی ئەو سودانە ئەكەن كە دەستئەكەوێت لە زانینی مەككیو مەدەنی، لەو سودانە:

١ـ پشتیان پێئەبەسترێت بۆ تەفسیركردنی قورئان و دەرخستنی "ناسخ" لە "منسوخ".

٢ـ سودی باشیان ئەبێت بۆ چۆنێتی بانگەوازكردنو ناساندنی ئیسلامو بنەماكانی ئیسلامو قۆناغەكانی فەرز بوونی ئەركە شەرعییەكان، تا هەریەكەو بە زمانی خۆی و لە ئاستی خۆیدا بدوێنرێ.

---

[1] بۆ ئەم خاڵانە سوود لە "مباحث في علوم القرآن/ مناع القطان و علوم القرآن، أحمد عادل كمال" وەرگیراوە.

٣ـ له سۆنگەی "مەككی"و "مەدەنی"ییەوە شارەزایی باش پەیدا ئەكرێت له ژیاننامەی پێغەمبەردا (**صلی الله علیه وآله وسلم**) و دەردەكەوێ چۆن ژیاوەو چۆن (سروش)ی هاتوەتە سەرو چۆن هەڵوێستی لە گەیاندنی ئەو ئایەتانە وەرگرتووە.

٤ـ زانینی مەككیو مەدەنی، سودی ئەوەی هەیە لە مێژووی (یاسادانی ئیسلامی) ئاگادار ئەبیتو ئەزانی فلآنە فەریزە بە چەند قۆناغ فەرز كراوە.

٥ـ مرۆڤ بە زانینی درێژەی ئەم (مكیو مدنی)یە، ئەو متمانەیەی بۆ دروست ئەبێت كە ئەم قورئانە بە دڵسۆزیو گرنگیپێدانەوە وەرگیراوە و گوازراوەتەوە بۆ نەوەكانی داهاتوو بە رادەیەك ئەزانرێت كامە ئایەت لە مەككەو كامە لە مەدینە دا دابەزیوەو چۆن دابەزیوەو چەندێك بووە.[1]

## باسی چوارەم: "عام"و "خاص"

یەكێك لە زانستەكانی قورئان بریتییە لە زانینی "عام"و "خاص"ە لە قورئاندا، "عام" واتە: ئەو وشەیەی كە هەموو ئەو شتانە بگرێتەوە كە ئەو ناوەی بەسەردا ئەبڕێت. "خاص"یش واتە: ئەو وشەیەی كە تەنیا چەند شتێكی تایبەت ئەگرێتەوە.

نموونە: وشەی (**شيء**)یان (إنسان) یان (**ظلم**) ئەمانە وشەی (عام)ن هەموو ئەو شتانە ئەگرێتەوە كە پێی ئوترێت (شت) یان (مرۆڤ) یان (ستەم).

ـ زانایان ئەفەرمون (صیغەكانی عموم، یان عام) چەند جۆرێكن:

١ـ ووشەی "كل و جميع" و "**كافة**" و "معاشر" و "**قاطبة**".. مانای "عام" ئەگەیەنن, وەك ئەفەرموێ. (**كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ**).( **آل عمران: ١٨٥**)، یان "**نحن معاشر الأنبياء...**".

٢ـ ئەو ووشانەی"ئەل"ی تەعریفی لە سەرە[2] و بۆ (جنس) بەكاردێ, وەك. (**وَالْعَصْرِ * إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ**) (**العصر: ١ ـ٢**). واتە هەموو مرۆڤێك, یان ئەفەرموێ: (أحلّ الله البيع) واتە هەموو كڕین و فرۆشتنێك.

---

[1] بۆ زیاتر سودوەرگرتن لەم بابەتە سەیری هەردوو سەرچاوەی ناوبراو بكە، (ل٥٥)ی یەكەمو (ل٧٧)ی دووەم.

[2] "ئەل" دوو جۆرە: "ئەلی تەعریفی جنسی و ئەلی عەهدی زیهنی, "عام" لە یەكەمیاندایە نەك لە دووەمیاندا.

٣ـ هەموو "نكره" یەك ئەگەر دوای "ل" نفی بێت, وەك: **(فلا رفث ولا فسوقة ولا جدال في الحج)** هەروەها وەك: (فلا تقل لهما اف)، (نەهی)یش وەك: (لا اله الا الله).

٤ـ یان لە دوای (**شرط**)ە وە بێت, وەك: (وان احد من المشركين استجارك فاجره) یان لە دوای استفهامی ئینكارییەوە بێت, وەك: (هل تعلم له سميا).

٥ـ هەموو (أسمای مەوصولە) وشەی (عام)ن، وەك: (**الذي, التي, اللذين ...هتد**) "**والذي قال لوالدية اف لكما**". واتە: هەموو ئەو كەسانەی كەوا دەڵێن بە دایكو باوكیان.

٦ـ هەموو (ئەسمائی **شرط**) مانای (عام) ئەدەن، وەك ئەفەرموێ: **(إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا) (البقرة: ١٥٨)** یان ئەفەرموێ: **(وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ اللّهُ) (البقرة: ١٩٧)**.

٧ـ هەموو ناوێك كە بۆ ڕەگەزێك بە كار بێت و بدرێتە پاڵ (معریفە)یەك وەك ئەفەرموێ: **(فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ) (النور: ٦٣)** مەبەست هەموو فەرمانێكی خوای گەورەیە.

٨ـ (ئەسمائی استفهام) هەمووی مانای (عموم)ی تێدایە وەك: **(مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللّهَ قَرْضاً حَسَناً) (البقرة: ٢٤٥)**.

٩ـ هەموو ناوێكی كۆ (جمع) كە **ئیضافە** بكرێت بۆ نموونە: **(يوصيكم الله في او لادكم للذكر مثل حظ الانثين)**، یان **(خذ من اموالهم صدقة تطهرهم و تزكيهم بهما)**، یان (حرمت عليكم امهاتكم) وشەی (اولادكم) و(اموالكم) و(أمهاتكم) هەرسێكیان (جمع)ن و **ئیضافە** كراون بۆ لای **ضمیری** (كم) ماناكانیان بوونەتە (عام) واتە: هەموو منالێك و هەموو ماڵێك و هەموو دایكێك.

١٠ـ (نكره)ی وەصفكراو مانای "عموم"ی تێدایە, وەك: **(ولعبد مؤمن خير من مشرك ولوا اعجبكم)** "**عبد**" نكرەیە و وەسف كراوە بەوەی ئیماندار بێت "**عبد مؤمن**" كە واتە هەموو كۆیلەیەكی ئیماندار ئەگرێتەوە بەبێ جیاوازی و سنور, یان خوای گەورە ئەفەرموێ. (**قول معروف خير من صدقة يتبعها اذى**) "معروف"یش لێرەدا بووەتە وەصف بۆ "قول" كە "نكرەیە" و مانای "عموم"ی پێداوە, واتە هەموو قسەیەك كە "چاك" بێت.[1]

[1] هەندێ لە زانایان ووشەكانی" ابدا" و" سرمدا" و"ابدالابدين" و" دهر الداهرين" و ئەو جۆرە" ظرف" انە كە مانای بەردەوامیان تێدایە بە یەكێك لە ووشەكانی (عام) (الفاظ العموم) دائەنێن سەیری: "أصول الفقة الذي لايسع الفقيه جهله", د. عياض بن نامی السلمي, ص٣٠٨" بكە.

* جۆرەكان و بەشەكانی (عام): زانایان ئەفەرموون: وشەكانی عام سێ جۆر مانایان لێوەر دەگیرێ:

١ـ (عام)ی به مانا (عام).

٢ـ (عام)ی بەمانا (خاص).

٣ـ (عام)ی به مانا (مخصوص).

مەبەستیش بەو سێ بەشە بە كورتی ئەمەیە:

١ـ (عام)ی به مانا (عام) واته به هیچ جۆرێك (تخصیص) ڕووی تێ نەكردووە و حوكمەكەی هەر بە (عموم)یەكەی ماوەتەوە, وەك: (والله بكل شئ عليم)، یان (**ولا يظلم ربك احدا**)، یان (حرمت علیكم امهاتكم). ئەمانە هەموو لە سەر مانا (عام)ەكەی خۆیان ماونەتەوە و (تخصیص) ڕووی تێ نەكردوون.

٢ـ (عام)ی به مانا (خاص), واته با ووشەكە بۆ (عام) به كاردێ بەڵام مەبەست پێی كەسێكی تایبەت یان شتێكی تایبەتە وەك ئەفەرموێ. (**الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ**) (آل عمران: ١٧٣), ئێستا لەم ئایەتەدا چەند لەفزێكی (عموم) بە كار هاتووە و مەبەست پێیان (خاص)ە:

* (**الذين**) یەكێكە لە ئەسمائی مەوصولە و ئەبێ (عام) بێت, كەچی لێرەدا مەبەست پێی ئەصحابی پێغەمبەرە (**صلى الله عليه وآله وسلم**) بە تایبەت.

* (الناس)ی یەكەم, لەفزێكی (عام)ە و كەچی مەبەست پێی (**نعیمی كوڕی مەسعود**)ەو مەبەست بە( الناس)ی دووەمیش (ئەبوسفیانی كوڕی حرب)ە.

یان كە خوای گەورە ئەفەرموێ: (فنادته الملائكه وهو قائم يصلى فى المحراب) مەبەست بەو (الملائكه) حەزرەتی جوبرەئیلە. دەی (الملائكه) لەفزێكی (عام)ە و مەبەست پێی مانایەكی (خاص)ەكە بریتییە لە حەزرەتی جوبرەئیل.

ـ (عام) بە مەعنای (مخصوص)یش واتە: با لەفزەكە (عام)ە، بەڵام ماناكەی تایبەتكراوەو لە (عام)دا نەماوەو تایبەت (مخصوص) بووە وەك:

(**وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً**). لێرەدا (الناس) پێی ئەوترێت: (عامی مخصوص)، یانی تەنیا ئەو كەسانە (حج)یان لەسەر فەرز ئەبێت، كە خاوەنی (تونا = **استطاعة**)ن.

جیاوازی نیوان (عـامی مخصوص)و (عـامی بەمانا خصوص) بریتییە لە:

١ـ "عـامی مخصوص" بە "قەرینەیەکی لەفزی" دەردەکەوێت، بەڵام (عـامی بەمانا خاص) بە "قەرینەیەکی عەقڵی" دەردەکەوێت، وە: (**وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً**). لەفزی: (من استطاع) وشەی (الناس)ی ـ تخصیص ـ کردووە، کەواتە (الناس) لەو ئایەتەدا پێی ئەوترێ (عـامی مخصوص).

بەڵام (**الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ**) بە قەرینەی عەقڵ ئەزانرێ کە مەبەست بە (الناس)ی یەکەم هەموو خەڵکی نییەو مەبەست بە (الناس)ی دووەمیش حەتمەن هەموو خەڵکی نییە، بەڵکو مەبەست بە یەکەم کەسێکی هەواڵگرەو مەبەست بە دووەمیش سوپای کەسێکی تایبەتە، یان سوپایەکی تایبەتە.

٢ـ مەبەست بە عـامی مخصوص، حەقیقەتی لەفزەکەیەو مەبەست بە (عـامی بەمانا خاص) مەجازی لەفزەکەیە، واتە: لەفزی (الناس) ـ بۆ نموونە ـ لە ئایەتی (ولله علی الناس) مەبەست پێی هەموو کەسێکە کە ناوی (خەڵك = مرۆڤ = الناس) بێت. بەڵام لە ئایەتی (قال لهم الناس) مەبەست پێی ـ مجاز ـ ی لەفزەکەیەو هەمو وکەسێ نییە کە پێی بوترێت (مرۆڤ).

٣ـ مەبەست بە (عـامی مخصوص) ئەوەیە هەموو ئەو کەسانە بگرێتەوە کە ئەو لەفزەیان بۆ ئەشێ نەك ئەو حوکمەیان بۆ ئەشێ، بەڵام (عـامی بە مانا خاص) مەبەست پێی ئەوەنییە کە هەموو ئەوکەسانە بگرێتەوە کە لەفزەکەیان بۆ ئەشێ و مەبەستیش نییە کە حوکمەکەشیان بۆ بشێت، هەر هەمان دوو ئایەتی سەرەوە ئەبێتە بەڵگە بۆ ئەم خاڵەش.[١]

ـ عام بەچی (تخصیص) ئەکرێت؟ زانایان ئەفەرموون: بەگشتی هەموو (عام)ێك لە قورئاندا بە دوو رێگە یان بە دوو شێواز (تخصیص) ئەکرێت: شێوازی یەکەم: بەبێ ناوبڕ (فصل) لە ئایەتەکەدا (مخصص)ەکە باس ئەکرێت، شێوازی دووەم: بە بەڵگەیەکی تری جیا (تخصیص) ئەکرێت کە یان ئایەتێکە لە شوێنێکی تردا، یان (حەدیسێکە)، یان (ئیجماعێکە)، یان (ئیجتیهاد)ێکە.[٢]

---

[1] سەیری (مباحث علوم القرآن: مناع القطان) ص ٢١٦تا ٢١٧، بکە.

[2] هەندێ لە زانایان ناویان ئەنێن (المخصص المستقل) و (غیر المستقل): تفسیر النصوص، محمد الدیب الصالح (٨٥/٢).

کورتەیەکی شێوازی یەکەم: زانایان باسی پێنج جۆر (مخصص) ئەکەن لەم شێوازی (تخصص) کردنەدا:

یەکەم: بەرێگەی (إستثناء) وەك ئایەتی: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ * إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا ..). (النور: ٤ ـ ٥).

دووەم: بەرێگەی (صفه) وەك ئایەتی: (وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ) (النساء: ٢٣).

سێیەم: بەرێگەی (شرط) وەك ئایەتی: (كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْراً الْوَصِيَّةُ) (البقرة: ١٨٠).

چوارەم: بەرێگەی (غایه) وەك ئایەتی: (وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ) (البقرة: ٢٢٢).

پێنجەم: بەرێگەی (بدل البعض عن الكل) وەك ئایەتی: (وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً) (آل عمران: ٩٧).

کە هەریەکە لە (الا الذین تابوا) و (دخلتم بهن) و (إن ترك خیرا)و (حتی یطهرن) و (من استطاع الیه سبیلا) پێیان ئەوترێت (موخەصیص)و بەبێ ناوبڕ (فاصل یان فصل) کاری ـ تخصیص ـ ەکەیان کردووە.[1]

کورتەیەکی شێوازی دووەم: زانایان باسی حەوت جۆر (مخصص) ئەکەن لەم شێوازەی تری (تخصیص) کردنەدا، (هەرچەندە مالیکییەکان باسی پازدە "مخصص" ئەکەن)[2]:

یەکەم: بەرێگەی (هەستکردن) (الحس) بۆ نموونە: (مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ) (الذاریات: ٤٢). دەی (من شيء) (عام)ەو بە هەست ئەزانین کە شاخ‌و دۆڵ و دەشتەکان هەر ماون و نەفەوتاون بەو رەشەبایە.

دووەم: بەرێگەی ژیری (العقل): بۆ نمونە: (الله خالق كل شيء) ژیری ئەڵێ کە خوا خۆی دروست نەکردووە.

سێیەم: بەرێگەی دەق (النصوص) چ قورئان بێت، یا حەدیس بێ.

---

[1] زانایان شەرح‌و تەفسیلی زۆریان کردووە بۆ هەریەك لەوانە لە کتێبەکانی (أصول الفقه)داو ئێمە لەبەرئەوەی کتێبەکە لە ئامانجی خۆی لانەدات زۆر بە کورتی ئەو باسانە ئەهێنین.

[2] تفسیر النصوص (٩٧/٢).

چوارەم: بەرێگەی بەراوردکاری (القياس).

پێنجەم: بەرێگەی باوی خەڵك (العرف).

شەشەم: بەرێگەی ئیجماع (الإجماع).

حەوتەم: بەرێگەی چەمکەکان (المفهوم)[1]، کە (مەفهومی موخالەفەو مەفهومی موافەقەش ئەگرێتەوە).

**تێبینیەکی گرنگ لەم بابەتەدا:**

زانایان سێ رایان هەیە لەسەر کارکردن بە (عام)، هەیانە ئەفەرمون: کار بە (عام) ناکرێت، بەڵکو ئەبێت بۆ (مخصص)ی ئەو (عام)ە بگەڕێینو کار بە (خاص)ەکە بکرێ، چونکە هیچ (عام)ێك نییە لە قورئاندا کە (تخصيص) نەکرابێتو قسەیەك ئەدەنە پاڵ (عەبدوڵڵای کوڕی عەباس) کە گوایە فەرمویەتی "وما من عام الا وقد خصص". کە ئەوەبووەتە قسەیەکی باوی ناو زانایانیش، لە کاتێکدا (ئیبن تەیمیە) ئەفەرموێ: (**لا يصح عنه رواية ولا دراية**).[2] ئیبن تیمیە ئەیسەلمێنێ کە زۆربەی (عموماتی قورئان) هەروەك خۆیان ماونەتەوەو کاریان پێ دەکرێ.[3]

هەندێکی تر ئەفەرمون کار بە (عام) ئەکرێ ئەگەر (تخصيص) نەکرابێو کار بە (خاص)یش ئەکرێو هەریەکەی لە شوێنی خۆیدا، هەندێکی تر ئەفەرموون کار هەر بە (عام)ەکە ئەکرێو پلە بەندی بۆ (مخصص)ەکان ئەکەن بۆ نموونە ئەڵێن: "**حەدیس**" ناتوانێ (عام)ی قورئان (تخصيص) بکاتو هەر بە (عموم)ەکەی ئەمێنێتەوە.

هەندێکی تر کە زیاتر (موعتەزیلە)و (هەندێ لە زانایانی ئەشعەری)ن رایان وایە کە کار نە بە عامەکەو نە بە خاصەکە ناکرێ تا (قەرینە) نەیبڕێتەوە، واتە ئەوەستن لە کارکردن بەو (دەقە گشتییە) (نص عام)ە تا قەرینە ئەیکاتە (عام)، یان قەرینە ئەیکاتە (خاص)، زانایان

---

[1] لە کتێبە ئەصولویەکاندا هەریەکەیان تیشکی لەسەر چەند دانەیەکیان داناوەو ئێمە بۆ زیادە زانیاری ئەوە حەوتەمان هێناوە، سەیری (القطان، مباحث علوم القرآن: ص ٢١٩). و (أصول الفقه/ عياض نامى السلمي: ص٣٤٨). وتفسير النصوص / محمد أديب صالح (٨٥/٢ بە دواوە) بکە بۆ درێژەی نموونەکان لەسەر هەریەك لەو خاڵانە.

[2] مجموعة فتاوى، ابن تيمية، (٤٤٢/٦).

[3] أصول الفقه، السلمى، ص٣١١.

بەمانە ئەڵێن (واقفە)و بە دوانەکەی پێشووش ئەڵێن (أرباب الخصوص) و (أرباب العموم)، واتە: ئەوانەی رایان وایە کار بە (عموم) ناکرێ و ئەوانەی رایان وایە کار بە (عموم) ئەکرێ.

## باسی پێنجەم: (مطلق) و (مقید)

(**مطلق**): واتە ئەو دەقە یان ئەو لەفزەی کە ئەبڕێت بەسەر ماناکەی خۆیدا بێ ئەوەی مەرجو (قید)ی لەسەر بێت، زۆرتر ئەو لەفزانە ئەگرێتەوە کە (نەکیرە)نو ناسروانین، یان وەسفکراو نین.

(مقید)یش بەپێچەوانەی ئەمەوەیەو بریتییە لەو لەفزەی کە لەگەڵ (قید)ێکدا ئەبڕێت بەسەر مانایەکدا.. بۆ نموونە خوای گەورە ئەفەرموێ: **(لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَـكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُواْ أَيْمَانَكُمْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ) (المائدة: ٨٩ )**، هەروەها ئەفەرموێ: **(وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِناً إِلاَّ خَطَئاً وَمَن قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَئاً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ)**.

لەم دوو ئایەتەدا وشەی (**رقبة**) هاتووە، لە یەکەمیاندا بەرەهایی هاتووەو (قید)و مەرجی لەسەر نییە، بەڵام لەدووەمیاندا (قید)و (مەرجی) (**مؤمنة**)ی بەسەرەوەیە. بە لەفزی یەکەمیان (**رَقَبَةٍ**) ئەوترێ (**مطلق**)و بە دووەمیان (**رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ**) ئەوترێت (مقید).

- جۆرەکانی (**مطلق**) و (مقید)

زانایان (**مطلق و مقید**) ئەکەنە چوار بەش:

١- (حوکمو سەبەب)یان یەك شت بێت.

٢- (حوکمو سەبەب)یان دوو شتی جیاواز بێت.

٣- حوکمیان یەك شتو (سەبەب)یان جیاواز بێت.

٤- حوکمیان جیاوازو (سەبەب)یان یەك شت بێت.

- کارکردن بە (**مطلق و مقید**)

زۆربەی زانایان ئەڵێن، کار بە (**مطلق**) ناکرێت، بەڵکو ئەبێت کار بە (مقید) بکرێتو چی دەقی (**مطلق**) هەیە پێویستە (مقید)ی دەقەکانی تری بۆ بهێنرێت، هەندێکی تر

مەسەلەکە ئەکەنە ئەو چوار بەشەو ئەڵێن: هەریەکەیان بڕیاری تایبەتی بۆ ئەدرێت، بۆ نموونە و سەلماندن:

ـ ئەگەر حوکمو سەبەب یەك شت بوون ئەوە کار بە (مقید)ەکە ئەکرێ، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ: (حرمت عليكم **الميتة** والدم) لێرەدا (الدم) بەرەهایی هاتووەو مەرجو (قید)ی لەسەر نییە. لە ئایەتێکی تردا هاتووە ئەفەرموێ: (**قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّماً عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَماً مَّسْفُوحاً**). لێرەدا (مسفوحا) بووەتە (قید) بۆ خوێنەکە.

(حوکمی) ئەو دوو (نص)ە ئەوەیە خوێن خواردنەوە حەرام ئەکەن، (سبب)و هۆکەشی ئەوەیە کە زیانیان بۆ تەندروستی هەیە، کەواتە (**مطلق**)ەکە لێرەدا حەمل ئەکرێتە سەر (مقید)ەکەو هەمان حوکمی ئەو وەردەگرێت.

ـ ئەگەر (حوکمو سەبەب) دوو شتی جیاواز بوون، ئەوە هەریەکەیان بە جیا کاری پێدەکرێ، وەك (السارق **والسارقة فاقطعوا** أيديهما) لەفزی (أيديهما) لێرەدا (**مطلق**)ەو قەیدی بەسەرەوە نییە، بەڵام خوای گەورە لە شوێنێکی تردا باسی دەست ئەکات (قید)ی ئەخاتە سەر، بۆ نموونە ئەفەرموێ: (**فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ** )، بەڵام سەیر دەکەی ئەم دوو (نص)ە، نە (حوکمەکانیان)و نە (سەبەبەکانیان) یەك شت نین، بەڵکو دوو شتن.

حوکمی دەقی یەکەم: دەست بڕین، حوکمی دەقی دووەم: دەست شۆردنە لەگەڵ ئانیشکدا. (سبب)ی دەقی یەکەم (دزی کردنە)و (سبب)ی دەقی دووەم: نوێژکردنە، کەواتە لێرەدا ـ **مطلق** ـ حەمل ناکرێتە سەر (مقید)و هەریەکەیان بەجیا کاریان پێئەکرێت.

ـ حوکمیان یەك شتو سەبەبەیان جیاوازە، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ: (**فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا**). کە (سبب)ەکە (**ظهار**)ەو حوکمەکە ئازادکردنی کۆیلەیەکە بە (**مطلق**)ی، خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ: (**فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ**) کە (سبب)ەکە کوشتنی بەهەڵەیەو حوکمەکەش ئازادکردنی کۆیلەیەکی موسڵمانە.

لێرەدا حوکمی کەففارەتی (**ظهار**)و (**قتل خطأ**) یەك شتە کە ئازادکردنی کۆیلەیە، بەڵام (سبب)ەکان جیاوازن، ئەو (**ظهار**)ەو ئەم (**قتل خطأ**)ە.. زانایان لێرشەدا (حەنەفییەکان نەبێ) ئەڵێن: (**مطلق**)ەکە حەمل ئەکرێتە سەر (مقید)ەکە و هەمان حوکم ئەدرێت بۆ

هەردووكیان، واتە ئەبێ لە هەردوو كەفارەتەكەدا كۆیلەكە موسڵمان بێت، كە ئازاد ئەكرێت..

حوكمیان جیاوازو سبب یەك شتە: بۆ نموونە خوای گەورە ئەفەرموێ: **(فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ)** لە دوای ئەوە ئەفەرموێ: **(وَتَيَمَّمُواْ صَعِيداً طَيِّباً فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ)**، یەكەمیان دەقێكی (مقید)ەو دووەمیان دەقێكی **(مطلق)**ە، (سبب) لە هەردوكیاندا یەك شتە، كە (نوێژ كردنە). بەڵام حوكمەكان دوو شتن لە یەكەمدا (شۆردنە)و لە دووەمدا (مەسح كردنە).

زانایان ئەفەرموون: لێرەدا هەر دەقەی بەجیا كاری پێ ئەكرێتو **(مطلق)** حەمل ناكرێتە سەر (مقید).

## باسی شەشەم: (ناسخ)و (مەنسوخ)

هەندێ لە زانایان (ناسخ و مەنسوخ) و (عام) و (خاص) بە یەك شت ئەزانن و بڕوایان وایە مەبەست بە ناسخ و مەنسوخ هەر (عام) و (خاص)ەكەیە و لە قورئاندا هیچ ئایەتێك نەسخ نەكراوەتەوە، بەڵكو (تخصیص) كراوە و خوای گەورە ئایەتی خۆی نەسخ ناكاتەوە، بەڵام لەبەر بەرژەوەندی عەبدەكانی (تخصیص)یان ئەكات, وەك ئەفەرموێ: **(كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ * أَيَّاماً مَّعْدُودَاتٍ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ)**. **(البقرة:١٨٣ ـ ١٨٤ )** هەندێ ئەڵێن: **( وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ) (البقرة: ١٨٤) ـ** مەنسوخە ـ و بە ئایەتی **(فمن شهد منك الشهر فليصمه)** نەسخكراوەتەوە, بەڵام ئەو زانایانەی تر ئەفەرمون: نەخێر ئەوە نەسخنەكراوەتەوە و حوكمەكەی هەر ماوە, وەك ئیبن عەبباسیش ئەفەرموێ: **(ليست بمنسوخة, هي للشيخ الكبير و المرأة الكبيرة لايستطيعان ان يصوما فيطعمان كل يوم مسكينا)**.[1]

ئەم زانایانە با بڕوایان بە( نەسخ) نییە لە قورئاندا بەڵام بڕوایان وایە كە "نەسخ" لە عەقڵدا مومكینە، بەڵام ڕوودانی لە شەرعدا مەحاڵە ئەو زانایانەی كە بڕوایان بە(نەسخ)

[1] مباحث في علوم القران / القطان, ص٢٣٦

نییە لە قورئاندا, بریتین لە هەندێ لە زانایانی کۆن وەك: "ابو مسلم الاصفهانی (ت: ٣٢٢ھ), تازەکانیش وەك (مەلا مستەفای زەڵمی)یە کە هێشتا لە ژیاندایەو کتێبێکی گەورەی هەیە هەموو ئەو بڕیارانە رەت ئەکاتەوە کە ئەوترێ فلانە ئایەت و فیسارە ئایەت (مەنسوخ)ن و ئایەت ئایەت باسی هەموویان دەکات و ئەیسەلمێنێ کە ئەو ئایەتانەیان ئیمکانی (جەمع و تەوفیق) هەیە لە نێوانیاندا، یان باسی دوو شتی جیا لە یەکتر ئەکەنو هیچ جۆرە (**تعارض**)و (**تناقض**)ێك نییە لە نێوانیاندا.[1]

دوای ئەم زانایانە سێ رای تریش هەیە دەربارەی "نەسخ لە قورئاندا":

رای یەکەم: کە جمهوری زانایانە، بڕوایان وایە کە نەسخ شتێکی (مومکینە) لە رووی عەقڵەوەو شتێکی واقیعیشە لە رووی شەرعەوە (واتە روویداوە لە دەقەکانی شەریعەتدا).

رای دووەم: رای شیعە رافیزەکانە کە بڕوایان وایە خوای گەورە (**سبحانە وتعالی**) سیفەتێکەی هەیە پێی ئەوترێت (**البداء**) واتە: جاری وا هەیە خوا شتێك بڕیار ئەدات پاش ماوەیەك بۆی دەرئەکەوێ کە ئەو بڕیارە هەڵەیە باش نەبووەو بەرژەوەندی تێدا نییە! بۆیە ئەیگۆڕێت بە شتێکی باش، پاش ئەوەی خراپی شتەکەی پێشووی بۆ دەرئەکەوێ "ئەم رایەش رایەکی سەقەتو ناشەرعییەو خوای گەورە زانایە بە هەموو شتێكو رێناکەوێ باری بەرژەوەندی شتێك نەزانێت و دوایی بۆی دەربکەوێت، چونکە ئەوە (کەمیو نوقسانییە) و خوای گەورە لەو سیفەتە دوورە".

رای سێیەم: رای زانایانی (جولەکە)یە کە نکوڵی لە (نەسخ) ئەکەن و ئەڵێن نەسخ (**بداء**) ئەخوازێت و ئەوەش مەحاڵە بەسەر خوادا بێت.[2]

لەبەرئەوەەی نەسخ لە قورئاندا جێگەی مشتو مڕی زانایان و ئەوانەش کە رایان وایە (نەسخ) لە قورئاندا نییە، بەڵگەکانیان بەهێزو زانستییە، ئێمەش لەم کتێبەدا ناچینە ناو ئەو باسانەی کە درێژە ئەدەنە ئەم بابەتەو باسی بەشو جۆرەکانی (نەسخ) ئەکەن چ لە قورئاندا و چ لە حەدیس دا، یان باسی ناسخەکان ئەکەن وەك قورئان و حەدیسو ئیجماعو قیاسو بەرژەوەندییە بێ سنورەکان= المصالح المرسلە.

---

[1] کتێبەکەی ناوی (البیان في رفع غموض النسخ في القران), کە لە ڕاستیدا کتێبێکی زۆر زانستی و قووڵە و لایەق نییە بۆ کەسێك کە نەیخوێندبێتەوە و هێرش بکاتە سەری یان خوێند بێتیەوە و لێی حاڵی نەبووبێ, یان حاڵی بوبێ و لەبەر چاولێگەری و قسەی ئەمو ئەو نکولی لێ بکات.

[2] مباحث في علوم القرآن/ مناع القطان، ص٢٢٦، ٢٢٧.

تەنیا ئەوەندە ئەڵێین: أـ کە هەرکەس ئەیەوێت لە راستی و درێژەی ئەم باسە بگات با کتێبی (**التبيان في رفع غموض النسخ في القرآن**)ی دکتۆر موستەفا زەڵمی بخوێنێتەوە کە زۆر زانستییانە و قووڵ ئەم بابەتەی چارەسەر کردووە. ب ـ ئەوانەی کە رۆچوون لە نەسخی قورئاندا کەوتوونەتە چەند هەڵەی گەورەوە:

١ـ "تدرج"یان لە قورئاندا لێ بووە بە (نەسخ) وەك قۆناغەکانی حەرامکردنی عارەق، چونکە خوای گەورە لە هیچ ئایەتێکدا حوکمی ئەوەی نەداوە کە عارەق حەڵاڵە، دەی ئیتر نەسخی چی کردووە؟

٢ـ وا حاڵی بوون کە هەر حوکمێك لەبەر هۆیەك درابێتو پاشان هۆکە نەمابێ و حوکمەکە گۆڕا بێت ناویان ناوە نەسخ، وەك ئەو هەمووە ئایەتەی کە باسی ئارامگرتن و دەستنەکردنەوە ئەکات لە کافرانو ستەمکاران، لەبەر کەمیو بێدەسەڵاتی موسڵمانان گوایە هەمووی بە ئایەتی سەیف نەسخ بوونەتەوە، لە کاتێکدا ئەوە نە نەسخەو نە حوکمیشیان ئیلغا بووەتەوە، بەڵکو هەرکات ئەو هەلومەرجانە دروست بونەوە هەمان رێنماییو داواکاریی ئەکرێتەوە لە ئیمانداران و بۆ کەس نییە نەسخیان بکاتەوە.

٣ـ وا ئەزانن کە ئیسلام باوێکی خراپی ناو خەڵکی لابردبێت (وەك یاسای بە کوڕ کردن = تبني)، یان مارەکردنی باوەژن بۆ نموونە، ئەوە ئیسلام نەسخی کردۆتەوە، لە کاتێکدا لە پێشدا هیچ ئایەتێك نەهاتووە ئەو حوکمە دابمەزرێنێ تا ئایەتەکانی تر بکرێنە نەسخو بە هەڵە بخرێنە ناو بابەتی ناسخو مەنسوخ!

٤ـ لەوەدا بە هەڵەدا چوون کە هەستیان کردووە (**تناقض**) و دژایەتی لە نێوان فلانە ئایەتو فیسارە ئایەتی تردا هەیە، لە کاتێکدا هیچ جۆرە تەناقوزێك لەو نێوانەدا نییەو ئەو تووشی وەهمو خەیالات بووەو هەر ئایەتەی باسی بابەتێك ئەکات جیا لە بابەتی ئەویتریان.

٥ـ ئەو کەسانە وائەزانن ئایەتێك کە (**تخصيص**)ی ئایەتێکی تری کرد ئەوە ئیتر ئایەتی پێشووی نەسخ کردووەتەوە بەهەڵەدا چوون، وەك ئایەتی میرات بۆ ئایەتی (**وصية**) بۆ نموونە، لە کاتێکدا ئەوە (**تخصيص**)ەو (نەسخ) نییە.[١]

[1] ئایەتی (وصیە) ئەفەرموێ: (كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْراً الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُتَّقِينَ) (البقرة : ١٨٠ )، ئایەتی "میراث"، یان (مواريث)یش بریتییە لەو ئایەتەی کە باسی

٣ـ "نەسخ کردن" پرۆسەیەکی زانستی وردەو پاش هەڵگرتنی چەند هەنگاوی تری پێش نەسخ ئەوجا پەنای بۆ ئەبرێت، نەك هەر کەمترین ڕێنەکەوتن و **(تعارض)** هەست پێ کرا خێرا پەنا بۆ نەسخ کردن ببرێت.[١]

**پرۆسەی نەسخ کردن بەم هەنگاوانەدا ئەڕوات:**

هەنگاوی یەکەم: **(توثيق النصين)**، لە ڕووی (سند) و لە ڕووی **(متن)**و لە ڕووی ماناوە.

هەنگاوی دووەم: **التوفيق بين النصين:** بە جیاکردنەوەی بابەتەکانیان بۆ نموونە، یان پلەکانیان، یان حوکمەکانیان.

هەنگاوی سێیەم: **ترجيح أحد النصين:** لە ڕووی (مرجحات)ەوە نەك لە ڕووی ئارەزووبازییەوە.

هەنگاوی چوارەم: **إعمال قاعده النسخ:** پاش دڵنیابوون لە مەرجەکانیو لە مێژووی دوو دەقەکە.

هەنگاوی پێنجەم: **أسقاط النصين او لتوقف المزيد بحث أو التخيير.**[٢]

---

میرات دابەشکردن ئەکات وەك: (يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ آبَآؤُكُمْ وَأَبناؤُكُمْ لاَ تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعاً فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيما حَكِيماً) (النساء: ١١ )، ئەوانەی بڕوایان بە (نەسخ) نییە ئەڵێن ئەوە (تخصیص)ە نەك (نەسخ)و ئایەتی (وصیە) باسی مافی مردوو ئەکات لەو بڕە پارەیەی کە بۆی هەیە وەسیەتی تێدا بکاتو ئایەتەکانی "میراث" یش باسی دابەشکردنی ئەو بڕە پارەیەئەکات کە مافی زیندووەکانە بۆ مردوو نییە زیندوو ەکانی لێ بێبەش بکات، کەواتە (تناقض) کوا، تا پەنا ببرێت بۆ (نەسخ)؟!

[1] دکتۆر یوسف القرضاوی لە (السنة مصدرا للمعرفة والحضارة ص٦١)دا ئەفەرموێت: "والحق ان كثيراً مما قيل فيه بالنسخ ليس بمنسوخ حقيقة بل كلا النصين كان يمثل سياسة شرعية نبوية في موقف معين و لاسباب وملابسات معينة، فلما تغير السبب الموجب: تغير الحكم" ت. و.

[2] زانایانی ئیسلامی چەند ڕایەکیان هەیە لەسەر ئەم ڕیزبەندییە، هەیانە پاش هەنگاوی یەکەم هەنگاوی چوارەم پێش سێیەمو دووەم ئەخات، وەك دکتۆر زەیدان لە (الوجيز: ص٣٩٦)دا، هەیشە هەنگاوی چوارەم ئەخاتە سێیەمو سێیەم ئەخاتە چوارەم، هەشە ئەو تەقسیمبەندییە ئەکات کە ئێمە نووسیومانە وەك دکتۆر موستەفا زەڵمی لە (التبيان ص٣٩ـ ٤٠)دا، ئێمە لەبەرئەوەی چ (شەرع) و چ (عەقڵ) چ (ئیجماع) پشتی ئەو ڕیزبەندییە ئەگرێت،

٤ـ نەسخ لە قورئاندا رووی نەداوە، بەڵام لە حەدیس دا نەسخی زۆر روویداوەو لەوەدا کێشەیەك نییە، چونکە پێغەمبەری خوا (**صلی الله علیه وآله وسلم**) بۆ دیاریکردنی باری بەرژەوەندی خەڵکە بە پێی توانای خۆی هەوڵیداوە و سروشتییە لە پاشاندا بۆی دەرکەوتبێ کە بەرژەوەندی خەڵك لە بارێکی تردایە، نەك ئەوەی ئەم سەرەتا فەرمویەتی. بۆ نموونە: ئەفەرموێ: (ألا أنی نهیتکم عن زیاره القبور، ألا **فزوروها فانها تذکرکم الآخرة) (رواه الحاکم)**، بەڵام خۆ خوای گەورە وانییە کە نەزانێ لە داهاتوودا چی رووئەداتو سەرەنجامی ئەو بڕیارە سەری لە چییەوە دەرئەچێت، بەڵکو خوای گەورە زانایە بە "رابردوو" بە "ئێستا"و بە "داهاتوویش". [1]

دکتۆر **طه جابر العلواني** لە کتێبی: **"دراسات قرآنیة أزمة الانسان ودور القرآن الکریم في الخلاص منها"** پرۆژەیەکی (شەش خاڵی) ئەهێنێت بۆ هۆشیارکردنی (ئوممەتی ئیسلامی) کە ئەو ناوی (أمه **القطب**)ی لێ ئەنێ، یەکی لەو خاڵانە ئەوەیە ئەفەرموێت: **"**ئەگەر بمانەوێ قورئان بدەین بە گوێی هەمو جیهانداو تەحەدای هەموو خەڵکی پێبکەین پێویستە دووبارە خوێندنەوەیەکی تازە بکەینەوە بۆ ئەو هەمووە کەلەپورەی دەربارەی زانستەکانی قورئان نووسراوە و بە ترازووی قورئان بیکێشین تا قورئان خۆی بڕیاری راستیو ناڕاستی بدات تیایاندا، هەندێ لەو زانستانە کە دراونەتە پاڵ قورئان بوونەتە بار بەسەر قورئانەوەو زۆر جار ناحەزانی قورئان ئەیکەنە مایەی ئاژاوەیەکی گەورە لەناو موسڵماناندا کە زۆربەی موسڵمانان زانیاریی تەواویان نییە لەسەر ئەو زانستانە وەك: "هونەرەکانی خوێندنەوەی قورئان"و "تەقسیمبەندی زۆربەی زانایان بۆ قورئان خوێنەکانو جیاوازی دروست کردن لە نێوان (**قرءاة**)و (**روایة**)و (**شاذ**)و (**آحاد**)و (**متواتر**).. کە پێویستە ئەو جۆرە زانستانە وەك قۆناغێکی مێژوویی سەیر بکرێنو نەکرێنە باسی ناو خانەکانی پەخشو چاپکردن.

---

ئەومان بە راستتر زانی و هێنامان، بۆ ئەمەی کە شەرع وا ئەڵێ: خوای گەورە ئەفەرموێ: "اتبعوا ما أنزل الله الیکم" عەقڵیش ئەڵێ: (نەسخ لقێکی (تەناقوض)ەو کاتێك ئەبێت پەنای بۆ ببرێت کە مومکین نەبێت کە کۆبکرێنەوەو هەردووکیان پێکەوە کاریان پێ بکرێت، ئیجماعیش ئەڵێ: زانایان یەکدەنگن لەوەدا کە لابردنی تعارض" ئەبێ بە کۆکردنەوەو پاشان تەرجیحدان و پاشان نەسخکردندا بڕوات، نەك بە پێچەوانەوە، (التبیان في رفع غموض النسخ في القرآن، ص٣٨و ٣٩و ٤٠)

[1] هەندێ لەم خاڵانە بیرۆکەی دکتۆر موستەفا زەڵمییە لە کتێبی: "أصول الفقه الأسلامی في نسجیه الجدید: ص٣١٢".

هەروەها وەك حەوت پیتەکانی قورئانیش و مەسەلەکانی (ناسخو مەنسوخ) هەموو ئەو باسانە پێویستە بچنە ناو (مەسەلە ئەکادیمییەکان) و سەرلەنوێ خوێندنەوەیان بۆ بکرێتو هەڵسەنگێرێنو بڕیاری (کاربڕو کۆتایی)یان تێدا بدرێت وەك چۆن زانایانی کۆن هەڵسەنگاندنیان کردووە، ئەو باسانە ئێستا بوونەتە "فیتنە" بۆ نەوەکانی ئەم سەردەمە و ناحەزانیش بۆ گومان دروست کردن لەسەر قورئان بە هەموو جۆرێك بەکاری دەهێننو پێویستە ئەو دەرگایانە هەروا بە کراوەیی نەمێنن لەبەردەم ناحەزانی قورئاندا".[1]

## باسی حەوتەم: زانستی غەریبی قورئان

(غریب)ی قورئان واتە: ئەو وشە قورئانییانەی کە ماناکانیان لە خودی خۆیاندا یان لە سیاقی ئایەتەکاندا زۆر ڕۆشن نییە، هەندێ لە زانایانو نووسەرانی ئیسلامی ئەم بابەتە لە ژێر ناونیشانی (موشتەرەکی لەفزی) یان (موشکەلی قورئان) دا باس ئەکەن، واتە ئەم وشانەی کە هاوبەشن لە نێوان چەند مانایەکدا یان ئیشکالات هەیە لە ماناکانیدا، باچەند بڕگەیەك باس بکەین:

١ـ هەندێ وشەو ئایەت کە ماناکانیان زۆر روون نییە.

٢ـ هەندێ وشەو ئایەت کە دوو مانا یان زیاتر یان هەیە.

٣ـ هەندێ وشە کە لە نێوان دوو مانادا هاتوچۆ دەکەن.

٤ـ هەندێ وشە کە لە نێوان دوو مانادا هاتووچۆ ئەکات.

٥ـ هەندێ وشەو ئایەت کە بە دوو خوێندنەوە ئەخوێنرێتەوە.

٦ـ هەندێ پیت هەیە لە قورئاندا مانای (وشە) یان تێدایە و چەند مانا ئەگەیەنێ.

٧ـ هەندێ پیت هەیە لە قورئاندا بەمانای پیتێکی تر دێت.

زۆر بە کورتی باسی هەریەك لەو بڕگانە بە نموونەیەك یان زیاتر ئەکەین:

١ـ ئەو وشەو ئایەتانەی کە ماناکانیان زۆر روون نین:

---

[1] سەرچاوەی ناوبراو (ص١١٣، ١١٤). دکتۆر مستەفا زەڵمی هەمان رای هەیە بۆ باسە دوورودرێژەکانی نەسخی قورئانو تەنانەت ئەڵێ: پێویستە لە کتێبەکانی "أصول الفقه"دا لابرێنو کەس نەیانخوێنێت. سەری (التبیان) بکە.

ـ حەزرەتی عومەر (خوای لێ رازی بێت) لە سەر مینبەر بوو ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە ئەفەرموێ: (**وَفَاكِهَةً وَأَبّاً**) (**عبس : ٣١** ). فەرموی: باشە ئەو (میوە) ئەزانن چییە، ئەی (أبا) یانی چی؟ پاشان رووی کردە خۆیو فەرموی: "**إن هذا لهو التكلف يا عمر**". ئەمە زۆر لەخۆکردنە عومەر!

ـ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ئەفەرموێ: نەمئەزانی: "**فاطر السموات والأرض**", مانای چییە، تا دوو کابرای دەشتەکی کێشەیەکی خۆیان هێنایە لام لەسەر (بیر)ێك، یەکێکیان هەر ئەیوت: "**أنا فطرتها**".[1]واتە: من سەرەتا دەستم بە هەڵکەندی کردووە. "واتە: تێگەیشتم کە "**فطر**" یانی دامەزراندنو دەستپێکردن هەر لە سەرەتاوە".

ـ ئیبن عەباس ئەفەرموێ: "**كل القرآن أعلم الا أربعا: غسلين، وحنانا، والأواة، والرقيم**".[2]

**٢ـ** هەندێ وشەو ئایەت کە دوو مانا، یان زیاتریان هەیە

ـ بۆ نموونە "**القضاء**" کە بە چەند مانا هاتووە لە قورئاندا:

١ـ "**فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ**" واتە: ئەو گیانەیان گل ئەدرێتەوە کە مردنی کۆتایی بۆ بڕیار دراوە.

٢ـ (**وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي الْكِتَابِ لَتُفْسِدُنَّ فِي الأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوّاً كَبِيراً**) (**الإسراء: ٤**). واتە: بەنی ئیسرائیلمان ئاگادارکردەوە.

٣ـ "**فقضاهن** سبع سموات" (فصلت ١٢) واتە: حەوت ئاسمانمان دروست کردووە.

٤ـ "**ثم اقضوا اليّ**" (یونس: ٧١). واتە: چی ئەکەن بیکەن و بەرێی مە مەوەستن.

٥ـ بەدادوەر ئەوترێ (**قاضي**)، چونکە کۆتایی بە کێشەکان ئەهێنێ، ئەوترێ (**قضي قضاؤك**). واتە: کۆتایی بە کارەکەت هێنراو جێبەجێ کرا، یان کەسێك کە بمرێ ئەوترێ: (**قد قضى**) واتە: لیبوویەوە.[3]

ـ یان بۆ نموونە: "**الرؤية**" کە بۆ چەند مانا بەکاردێت لە قورئاندا:

---

[1] مباحث في علوم القرآن: القطان ، ص٣٢٦.

[2] تأويل مشكل القرآن، إبن قتيبة، ص٩٨.

[3] تأويل مشكل القرآن، إبن قتيبة، ص٤٤١، ٤٤٢.

١ـ بینین به چاوی سەر: (وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ تَرَى الَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى اللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ) (الزمر : ٦٠ ).

٢ـ زانیاری پەیدابوون: "أرنا مناسكنا". واتە: فێرمان بکە (ویری الذین أوتوا العلم) واتە: ئەوانەی زانیارییان هەیە ئەزانن.

٣ـ هەواڵدان بە کەسێك: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيباً مِّنَ الْكِتَابِ) واتە: هەواڵتان پێنەدراوە.

زانایان وشەکانی "المختلفة، الهدی، الامة، العهد، الأل، القنوت، الدین، الایمان، الفتنة، البلاء، الاسلام، الایمان، الروح، الوحي، الفرح، الزوج، النسیان، السلطان، الخلق، المحصنات، المتاع، الحساب، .. هتد" بەو وشانە دادەنێن کە بۆ زیاتر لە مانایەك دانراون لە قورئانیشدا زیاتر لە مانایەك ئەبەخشن.[1]

٣ـ هەندێك وشە لە نێوان دوو مانادا هاتوچۆ ئەکەن، هەندێ بەمە ئەڵێن: "موشتەرەکی لەفزی".

ـ بۆ نموونە وشەی (قرء) کە خوای گەورە ئەفەرموێ: (وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ). زانایان ئەڵێن: (قرء) لە زمانی عەرەبیدا بەمانای (حیض) و بە مانای (طهر)یش دێت.. (مالك)و (شافعی)و (ئەحمەد)و (دواودی ظاهیری)و (أبو ثور)و (عائیشە)و (ئیبن عەباس)و (ئیبن عمر) و (زەیدی کوڕی ثابت)و (هەر حەوت فەقیهەکەی مەدینە)و (قتادە)و (زهری)و (ئەبانی کوڕی عوسمان) رایان وایە کە (قرء) یانی (طهر)، بەڵام (أبوحنیفە)و (ئەحمەد لە ریوایەتێکیدا) ئەڵێن: مەبەست لە (قرء) بریتییە لە (حیض).[2]

ـ یان بۆ نموونە وشەی (نکح) کە خوای گەورە ئەفەرموێ: (وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاء) هەندێ لە زانایان بە (عقد)و هەندێ بە (وطأ) مانای ئەکەنو هەردوو ماناکەش هەڵدەگرێ.

---

[1] هەمان سەرچاوە ص٤٤١، بە دواوە.

[2] هەردوولایان بەڵگەی (نەقڵی)و (عەقڵی) زۆر دێننەوە بۆ راکەی خۆیان، هەرکەس ویستی ئاگاداری ئەو موناقەشەیە بێت با سەیری بۆ نموونە (تفسیر النصوص)، (١٤٧/٢) بە دواوە بکات، یان سەیری (أصول الأحکام)ی (حمد کبیسی) بکات.

**٤ـ** هەندێ وشەو ئایەت كە بە دوو خوێندنەوە ئەخوێنرێنەوە

بۆ نموونە خوای گەورە ئەفەرموێ: (**فَيَقْتُلُونَ ويُقْتَلُونَ**) (**التوبة:١١١**), زانایان ئەڵێن بە خوێندنەوەیەكی تریش خوێنراوەتەوە: (**فَيُقْتلَوُن و يَقْتُلُونَ**) واتە لە یەكەمیاندا ماناكەی وایە, ئەكوژن و ئەكوژرێن لە دوهەمدا ماناكەی ئەبێتە ئەكوژرێن و ئەكوژن، واتە پاشو پێش ئەكەون.

یان: (**مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ**) به (**مَلِكِ يوم الدين**) و (**نَنشزُها**) به (**ننشرها**) یان (**ما أخلفنا موعدك بِمِلكِنا**) به **مِلْكِنا** و **مُلْكِنا** و **مَلِكِنا**) خوێنراوەتەوە و بەو پێیەش هەریەكەی مانایەكی زیادە ئەخاتە سەر ووشەكە.

**٥ـ** هەندێ پیت هەیە لە قورئاندا مانای وشەیان تێدایە.

وشەی (انی) بۆ نمونە كە بەمانای(من این) و بەمانای (كیف) دێت.[١] وەك ئەفەرموێ: (قلتم انى **هذا**) واتە ( من **اين هذا**), بەلاَم " **اني يحي هذه الله بعد** موتها " یانی (**كيف يحي هذه الله بعد** موتها), هەروەها (فاتوا **حرثكم انى** شأتم), واتە (كيف **شأتم**), بەلاَم زانایان بۆ ئەم ئایەتەی كۆتایی دوو مانای تری ئەكەن ئایا "عمومی حاڵەتە"، یان "عمومی شوێنە", زانایانی ئەهلی سوننەت ئەفەرمون: بە بەڵگەی ئەوەی ئەفەرموێ (**حرثكم**) كە واتە مەبەست شوێنی تۆوە نەك شتی تر، بۆیە زانایان ئەفەرمون مەبەست (**عموم الأحوال دون المحال**)ە.

پیتی (أم) كە مانای (أو) و مانای (پرسیار) و هەندێ مانای (بل + استفهام)یشی لێوەر دەگرن. خوای گەورە ئەفەرموێ: (**أأمنتُم مَّن فِي السَّمَاء أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ * أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاء أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِباً**). (**الملك: ١٦ـ ١٧**) لێرەدا بە مانای (او) دێت.

خوای گەورە ئەفەرموێ: (**ام يحسدون الناس علي ما اتاهم الله من فضله**). مەبەستی "أيحسدون الناس؟"ە.[٢]

---

[1] زانایان ئەفەرمون (انی) ئەگەر بچێتە سەر رستەی كردار( جملە فعلیە) ئەوە مانای(كیف) ئەگەیەنێ, بەلاَم ئەگەر چووە سەر رستەی ناوی( جملە اسمیە) مانای( من این) ئەگەیەنێت.

[2] مشكل القرآن، ابن قتتبة, ص٥٤٦.

هەندێ مانای (بل + استفهام) ی لێوەر دەگرن, وەك خوای گەورە ئەفەرموێ (أم خلقوا من غير شيء أم هم الخالقون) واتە( **بل أخلقوا من غير شيء**).[1]

٦ـ هەندێ پیت بە مانای پیتێکی تر دێت.

وەك: (فی) کە بە مانای (علی) دێت یان (باء) بە مانای (عن) دێت و (لام) بە مانای (علی) و (مع) و (الی) دێت. هەروەها, وەك ئەفەرموێ: **(وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ النَّخْلِ) (طه:٧١)**, لێرەدا (فِي) بە مانای (علی) دێت.

**(فَاسْأَلْ بِهِ خَبِيراً) (الفرقان:٥٩)** لێرەدا(بە) بەمانای (عنە) دێت.

**(وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْض) (الحجرات:٢)** (لە) بە مانای (علیە) دێت.

**(وَلاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَهُمْ إِلَى أَمْوَالِكُمْ) (النساء:٢)** (الي) بەمانای (مع) دێت.

**(بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا) (الزلزلة:٥) (لها)** بە مانای (الیها) دێت.

زانایان و لە وانە" ئیبنو قوتەیبە" لەم بابەتەدا و لە کتێبی **(تأویل مشكل القرآن)دا** باسی زیاد لە (١٥) پیت ئەکات کە ماناکانیان لە جێی مانای پیتێکی تر دانراوە و بە وورد بونەوە لێی بۆت دەرئەکەون.

سوودی ئەم بابەتە چییە؟ بۆچی خوای گەورە ئایەتەکانی قورئانی وا داناوە؟ ئەی بۆچی هەموو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی بە ڕوونی دانەبەزاندووە و هەموو کەس بێ ماندو و بوون و لێورد بوونەوە لێیان تێ بگات؟ درێژەی ئەم وەڵامە ئەخەینە باسی" موحکەم" و "موتەشابە" و لێرەدا تەنیا ئەوەندە ئەڵێین: خوای گەورە مەبەستیەتی بەم قورئانە عەقڵەکان بخاتە جوڵە و بیر کردنەوە تا گەشە بکەن و گەورە بن و جیاوازی لە نێوان زانا و نەزان و خەمخۆر و خەمساردا دەربکەوێت و خەڵکی فێری تەمەڵی و تەوەزەلی نەبن.

## باسی هەشتەم: زانستی (موحکەم و موتەشابە)

قورئان لە ئایەتێکی سورەتی (آل عمران)دا ئایەتەکانی قورئان ئەکاتە دوو بەشەوە بە شێکیان ناو ئەنێ" محکمات" و بەشەکەی تریان ناو ئەنێ"متشابهات" ئەوەتا ئەفەرموێ:

---

[1] ئیبنو قوتەیبە زیاد لە( ٣٥) پیت باس ئەکات کە مانای تایبەتی ئەدەن لە ژێر ناونیشانی( حروف المعانی)دا لە ل(٥١٧)ەوە تا ل(٥٦٣).

(هُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاء الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاء تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا) (آل عمران:٧). واته به پێی ئەم ئایەتە قورئان دوو جۆر ئایەتی لە خوی گرتووە" موحکەمەکان" و" موتەشابهەکان". کەواتە "موحکەم" چییە و "موتەشابە" چییە؟.

زانایان تەفسیر و ڕای جیا جیایان هەیە بۆ ناساندن و پێناسەی ئەم دوو ووشەیە کە لەم سێ پێناسەدا کورتیان ئەکەینەوە.

**پێناسەی موحکەم:**

١ـ ما عرف المراد منه, واتە ئەوەیە مانا و مەبەسەکەی دیارە و ئەزانرێت.

٢ـ ما لا يحتمل الا وجها واحدا, واتە ئەوەیە کە تەنیا یەك مانا هەڵدەگرێت.

٣ـ ما استقل بنفسه و لم يحتج الى بيان, واتە ئەوەیە سەربەخۆ مانا ئەدات و پێویستی بەوە نییە وشەیەکی تر ڕۆشنی بکاتەوە.

**پێناسەی "موتەشابە":**

١ـ ما استاثر الله بعلمه, واتە ئەوەیە تەنیا خوا ئەزانێ یانی چی.

٢ـ ما احتمل اوجه, واتە ئەو وشەیە کە چەند مانا هەڵدەگرێت.

٣ـ مالا يستقل بنفسه واحتاج الى بيان برده الى غيره,[١] واتە ئەوەیە سەربە خۆ مانا نادات بە دەستەوە و پێویستی بەوە هەیە لە ژێر مانای ووشەیەکی تردا مانای بکەی.

زانایان وەك لە پێناسەی (موحکەم و موتەشابهدا) ڕای جیا جیایان هەیە, هەرواش لە دیاریکردنی جۆری ئایەتە موحکەم و موتەشابهەکاندا ڕای جیاوازیان هەیە.

یەکێکی وەکو ئیبن حەزمی **ظاهری** ئەڵێت: "موتەشابهە لە قورئاندا بریتیيە لە سوێندەکان کە لە سورەتەکاندا هەیە وەك: **(والضحى والليل اذا سجى)**، (والفجر وليال عشر)، هەروەها پیتە تاكو جوتەکان کە لە سەرەتای سورەکاندا هاتوونو جگە لەمانە هەموو ئایەتەکانی قورئان موحکەمن).[٢] هەندێ لە زانایان بە پێی پێناسەکەی خۆیان

[1] سەیری (مباحث في علوم القران/ مناع القطان, ص٢٠٧) بکە.

[2] الاحكام في أصول الأحكام (٤٨/١، ١٢٣/٤)، هەروەها النبذ في أصول الفقه، ص١٠٢، تحقيق ابو عبدالله النجدي.

لایەکی تەواوی قورئان ئەکەنە (موتەشابھ)و ئەلێن (موتەشابھ ئەو وشەو ئایەتانەیە کە زیاد لە یەك مانا هەڵدەگرن).[1] هەندێکی تر ئەمسەریان لێ گرتووەو ئەلێن: "موتەشابھ هەر لە قورئاندا نییە".[2]

هەندێ روونکردنەوە بدەین لەم بابەتەدا تا خوێنەری بەڕێزی کورد بە گشتی و لاوانی تازەپێگەیشتووی دڵ پڕ لە ئومێد بەتایبەتی ، هیچ نەبێ لە باسەکە نزیك ببنەوەو ئەگەر لە راستی بابەتەکەش بەتەواوەتی نەگەن:

١ـ هۆی ئەوەی کە زانایان رای جیاجیایان هەیە لە موحکەمو موتەشابھ ئەوەیە، ئایەتەکەی سورەتی (**آل عمران**) بە دوو شێوە ئەخوێنرێتەوە:

یەکەمیان: لەسەر وشەی (الله) ـ لە ئایەتی (وما **یعلم تأویله** الا الله) ـ واجبە بوەستیو خوێندنەوەکە رابگری.

دووەمیان: وەستان لەوێدا واجب نییەو بەڵکو ئەبێ خوێندنەوەکە بدەیتە دەم (والراسخون فی **العلم**)و لەوێدا بوەستی .. بەم پێیە بێت مانای ئایەتەکە لە (باری یەکەم)دا واتە: تەنیاو بە تەنیا هەر خوا مانای ئایەتە موتەشابیهەکان ئەزانێت، مانای ئایەتەکە لە (باری دووەم)دا واتە: خواو زانا ریشەدارەکان مانای ئایەتە موتەشابیهەکان ئەزانن. جا ئەوانەی لەسەر خوێندنەوەی (شێوەی یەکەمن) ئەلێن: ئایەتە موتەشابیهەکان بریتین لەو شتانەی پەیوەندییان نییە بە (یاسا)و (حوکمە تەکلیفییەکانەوە)، چونکە عەقڵ نایبڕێ خوا تەکلیقی شتێك بکات لە خەڵکی نەزانن مانای چییە! لەبەرئەوە ئایەتە موتەشابیهەکان سنووردار ئەکەن لە:

١ـ پیتە تاكو جووتەکانی سەرەتای سوورەتەکاندا وەك (الم، الر، **کهیعص**، ن، ق..) .

٢ـ ئایەتەکانی (صفات) کە باسی (دەست) و (روو)و (چاو)و (نزیکی)و (حازر) .. ی خوا ئەکات.

٣ـ (هاتن)و (دابەزین)و (خێر وەرگرتن بە دەستی راست).. هتد ی خوا گەورە ئەکات.

٤ـ سوێندەکانی قورئانو کاتی هاتنی قیامەتو بینینی خوا لەبەهەشتداو .. هتد.[1]

---

[1] وەك جصاص بۆ نموونە لە تفسیر النصوص ٣١٣/١ .

[2] وەك عەبدولوەهاب خەلاف بۆ نموونە.

ئەوانەش لەسەر خوێندنەوەی (شێوەی دووەم)ن ئەڵێن: ئایەتە موتەشابیهەکان لە قورئاندا هەموو ئەو ئایەتانەن کە دوو ماناو زیاتر هەڵدەگرنو زانینی ماناو مەبەستەکانیان لای خواو لای ئەو زانایانەن کە ریشەدارن لە زانستی شەرعیدا. ..

"ئیبنو قوتەیبە" ئەفەرموێ: من لەوانە نیم کە ئەڵێن زانا ریشەدارەکان لە زانستدا مانای موتەشابیهەکان نازانن، ئەوە هەڵەیە بەدەم (زمان = اللغە)و بەدەم "مانا"وە ئەکرێت، چونکە خوای گەورە شتێکی لەم قورئانەدا نەوتووە کەڵکی نەبێت بۆ بەندەکانی، یان فێری ماناو مەبەستێکی خوایان نەکات، .. پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) دوعا بۆ ئیبن عەبباس ئەکاتو ئەفەرموێ: (**اللهم علّمه التأويل** وفقهه فی الدین).[٢] موجاهیدیش لەتەفسیری ئایەتەکەدا ئەڵێ: زانایان ماناکانی ئەزاننو ئەڵێن: (**آمنا به كل من عند ربنا**)، جا ئەگەر زانا ریشەدارەکان لە زانستدا، بەشو هەڵوێستیان هەر ئەوەندە بێت بڵێن: "**آمنا به كل من عند ربنا**" ئیتر چ فەزڵێکیان هەیە بەسەر خوێنەوارەکانی تردا، یان بەسەر عەوامو نەخوێندەوارەکانیشدا، چونکە خۆ هەموو هەر ئەڵێن: "**آمنا به كل من عند ربنا**".[٣]

دوای ئەمانە "ئیبن قوتەیبە" ئەفەرموێ: پاش ئەمانە، باشە خۆ ئێمە تەفسیرزانێك شك نابەین لە ماناکردنی ئایەتێکدا وەستا بێتو تەفسیری نەکردبێتو بڵێت: ئەمە موتەشابیهەو خوا نەبێ کەس بە مانای نازانێ، بەڵکو تەفسیری هەموو ئایەتەکانیان کردووەو تەنانەت تەفسیری پیتە تاكو جوتەکانیشیان کردووە کە لە سەرەتای سوورەتەکاندا هاتووە وەك (الم، حم، **طه**) و ئەوانی تری وەك ئەوان".[٤]

---

[1] سەیری (تفسیر النصوص، ٣١٣/١، بەداوە بکە.

[2] فەرمودەکە لە بوخاریدا هەیەو لە ریوایەتێکی تردا ئیبن عومەر ئەفەرموێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وآله وسلم) ئیبن عەباسی بانگ کردو دەستی هێنا بەسەریداو هەندێ لیکی دەمی خۆی کردە دەمی ئیبن عەبباسو فەرمووی: "الله فقهة في الدين وعلمه التأويل". سەیری (الإصابە، ٩١/٤) و پەراوێزی (تأويل مشكل القرآن)ی ئیبن قوتەیبە (ص ٩٩) بکە.

[3] تأويل مشكل القرآن، ص١٠٠.

[4] هەمان سەرچاوە لاپەڕە.

٢ـ خوا گەورە کە ئایەتەکانی قورئانی کردوە بە دوو بەشەوە "موحکەمو موتەشابھ" مەبەستی ئەوەیە کە خەڵکی بزانن ئایەتە موحکەمەکان هەموو ئەو ئایەتانەن کە بناغەو گۆڕیچەی هەموو مەسەلە گەورەکانیان لەسەر راوەستاوە وەك "بنەماکانی ئاینو بنەماکانی دەستوور".[١] و موتەشابیهەکانیش بریتین لەو ئایەتانەی کە زیاتر لە تایبەتمەندییەکانی زانایانو ئەوان ئەتوانن بیانهێننەوەو بۆ ژێر موحکەمەکان و لە ژێر تیشکی ئەو موحکەمانەدا تەفسیری تەواویان بۆ بکەن.. با ئەمە بەیەك دوو نموونە روونتر بکەینەوە:

نموونەی یەکەم: خوای گەورە ئەفەرموێ: (**أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ * الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ * لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ لاَ تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ**) (**يونس: ٦٢ ـ ٦٤**). سۆفیەکان بۆ ئەو ئایەتە شوێن ئاماژەکانی ئەو ئایەتانە کەوتوون و هاتوون ئەولیاکانیان ئەوەندە بەرزکردوەتەوەو ئەوەندە مانایان لە (**لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا**) دەرهێناوە، بردویاننەتە ریزی پێغەمبەران (**عليهم الصلاة والسلام**)، بەڵکو عەوامی وا هەیە لەپێغەمبەرانیش بەرزتریان کردونەتەوە و قەناعەتیان وایە کاروباری دونیاو ئاخیرەت لە "**دیوانی صالحین**" وە نەخشەی بۆ دائەنرێتو ئەوان خاوەنی زەویو ئاسمانەکانن و ئەو مەجلیسە سەنتەر و بڕیار دەرە بۆ ژیانو مرۆڤو بوونەوەر!!

سەیرت لەمە نەیەت و بە بوختانو قسەی کردنی بێ بناغەشی مەزانە بەدەم خەڵکەوە، بەڵکو ئەوە راستەقینەیەکە کە زۆر کەس نایزانێ و ئەوەشی ئەیزانێ ناوێرێ بە ئاشکرا بیڵێ، بەڵام (**فالله أحق أن تخشاه**).

(عبدالعزیز الدباغ الفاسی) ـ کە ئەحمەدی کوڕی موبارەکی ـ فیقهزان ـ لێوەی ئەگێڕێتەوە لە کتێبی (الابریز)دا نووسیویەتی ئەڵێ: گوێم لە شێخ بوو ـ رەزای خوای لێ بێت ـ ئەیوت: دیوانی صاڵحان لە ئەشکەوتی (**حراء**) دایە، (غەوس) لە دەرەوەی ئەشکەوتەکەدا دائەنیشێتو مەککە ئەکەوێتە شانی راستییەوەو مەدینەش ئەکەوێتە بەردەم ئەژنۆی چەپیەوەو چوار (قوتبی زەمانەش) ئەکەونە لای راستییەوە کە هەموویان سەر بە مەزهەبی ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەسن (رەزای خوا لێ بێت)، سێ قوتبی تر لە لای چەپیەوە هەن کە هەریەکەیان سەر بە مەزهەبێکن لە سێ مەزهەبەکەی تر، (وەکیل)یش

---

[1] تفسير النصوص، (٣١٨/١).

لەبەردەمیدایەو پێی ئەوترێ (**قاضي ديوان**)، کە لەم ڕۆژەدا ئەویش لەسەر مەزهەبی مالیکییە.. (غەوس) قسە لەگەڵ (وەکیل)دا ئەکات و هەربۆیەش پێی ئەوترێ (وەکیل)، چونکە لە جیاتی هەموو ئەوانەی لە دیواندا ئەو ئەتوانێ قسە بکات (شێخ فەرموی): ئیش‌و کار هەمووی بەدەست ئەو حەوت (قوتبە)یە، ئەوانیش بە ئاماژەی (غەوس) ئەجولێنەوە، هەر (قوتب)ێکیش لەو حەوت (قوتبە) ژمارەیەکی دیاریکراوو تایبەت لە ژێر دەستیاندا کارئەکەن‌و شەش ریزی تر لە پشت (وەکیل)ەوە هەیە.. (شێخ ڕەزای خوای لێ بێ ئەفەرموێ): هەندێ لە (پیاوەکامڵەکان) کە مردوون لەوێدا ئامادە ئەبن‌و ئەچنە ریزی زیندووەکان.. (ئەفەرموێ): جا فریشتەکان ئامادە ئەبن‌و ئەچنە پشت ریزەکانی ئەمانەوە، (جنۆکە کامڵەکانیش) بەهەمان شێوە ئامادە ئەبن‌و دێن... (خوای لێی رازی بێت ئەفەرموێت): هەندێ جاری واش هەیە پێغەمبەریش (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئامادەی ئەو دانیشتنانە ئەبێت.. و پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) هەر لەگەڵ (غەوس)دا قسە ئەکات، (غەوس)یش هەروەها تەنیا لەگەڵ پێغەمبەردا قسە ئەکات‌و ئەگەر پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) لەوێ نەبێ (غەوس) ئەوەندە نورانی ئەبێت کەس لە خەڵکی (دیوان) ناتوانن لێی نزیك ببنەوە، چونکە ئەیانسوتێنێ، بۆیە لە دوری ئەوەوە دائەنیشن، جا ئەوەی لە خواوە بۆیان دائەبەزێ تەنیا پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەتوانێ بەرگەی بگرێ‌و کە لە ئەویش دەرچوو تەنیا زاتی (غەوس) بەرگەی ئەو شتە ئەگرێ، لە (غەوس)یشەوە دابەش ئەبێت بەسەر هەر حەوت قوتبەکەداو لە قوتبەکانیشەوە دابەش ئەبێت بەسەر ئەهلی دیوان هەموویدا، .. ئەو سەعاتەی کە کۆبونەوەی دیوان ئەکرێت بریتییە لەو سەعاتەی کە پێغەمبەری خوا (**صلى الله عليه وآله وسلم**) تێیدا لە دایك بووە، دروست ئەو سەعاتەیە کە ئەکەوێتە سێیەکی کۆتایی شەو". [1] جا ئەوەی ئەم کتێبە ریوایەت ئەکات ئەڵێت:

گوێم لە شێخ بوو (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەیفەرموو: ئەو زمانەی ئەهلی دیوان قسەی پێ ئەکەن بریتییە لە زمانی (سریانی)، چونکە زمانێکی کورتەو وشەکانی مانای زۆر ئەگرنە خۆیان.. گوێم لێ بوو ئەیفەرموو: هەموو ئەو ئەولیانەی کە ئامادەی دانیشتنەکانی دیوان ئەبن ناتوانن سەیری (**اللوح المحفوظ**) بکەن، بەڵکو هەیانە ئەتوانێ سەیری بکات‌و

---

[1] الابريز (١٩٣ـ ١٩٤).

بیخوێنتەوەو هەشە تەنیا بەدڵ بۆی ئەروانێ .. گوێم لێ بوو ئەیفەرموو: ئەولیا بچوکەکان (بەلەشو بە گیان) ئامادە ئەبن، بەڵام ئەولیا گەورەکان هیچ سنوورێکیان بۆ نییە، .. شێخ ڕەزای خوای لێ ڕازی بێ ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە ئەولیای بچووك کە ئەڕوات بۆ دیوان ئەوە (لەشو گیان)ی ئەڕوات بۆ ئەوێو ئیتر لەناو ماڵو وڵاتی خۆیدا "غەیب" ئەبێت و بە تەواوەتی شار بەجێدێڵێ، چونکە بە "لەش" بۆ ئەوێ ئەڕوات، بەڵام ئەولیای گەورە بە دەوری سەری خۆیدا ئەسوڕێتەوەو گیانی لەوێ ئامادە ئەبێت و هەر لە ماڵەکەی خۆشیدا ئەمێنێتەوە، چونکە ئەولیای گەورە توانای گۆڕانکاری و گەشەکردنی بێسنوورەو ئەگەر بیەوێ ئەتوانێ بچێتە هەر شێوەیەك حەز بکات، لەبەرئەوە ڕۆحی کامڵ بووە هەرکەس بیەوێ ئەتوانێ لە شێوەی (سێ سەدو شەست و شەش) زاتی تر دا خۆی بنوێنێ... نەك هەر ئەمە، بەڵکو جارێکیان لە شێخم بیست (ڕەزای خوای لێ بێ) کە لە دەرەوەی حەبەشە بووین، کە دەرگایەکە لە دەرگاکانی فاس فەرموی: ئەرێ دیوان چییەو ئەولیا چییە، هەر هەموویان لە سنگی مندان!، جارێکی تریش گوێم لێبوو ئەیفەرموو: ئاسمانەکانو زەوییەکان بە نیسبەت منەوە وەك مسێکی کۆن وایە لە دەشتێکی کاکی بە کاکیدا فڕێدرابێت! ئەمە دەریایەکی بێ بنەو ئەوسەری دیارنییە، ئێمەش لەکەنارێکدا بە ئومێدو چاوەڕوانییەوە لێی ڕاوەستاوینو بە گوێلی بچوکی خۆمان لەو دەریا گەورەی شێخ ئاو هەڵدەگۆزین (ڕەزای خوای لێ بێ) هەریەکەمان بەپێی توانای خۆی".[1]

پاشان دوای ئەوە (دەبباغ) بە درێژی باسی ئیشو کارەکانی ئەهلی دیوان ئەکات کە چۆن بەرنامە بۆ ژیان دائەنێنو ژیانو بوونەوەر هەڵدەسوڕێنن کە ئەوەی بیخوێنێتەوە وەك نووسەری (**التوحيد والوساطة في التربية الدعوية**) ئەڵێت: ناتوانێ هاوملی (حەللاج)ی نەکات[2].

نموونەی دووەم: لەبەرئەوەی حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم (**عليه السلام**) بە ئیزنو یارمەتی خوا مردووی زیندوو ئەکردەوە و لە قوڕ باڵندەی دروست ئەکردو فووی پێدا ئەکردو ئەفڕیو کەچەڵو کوێرو لاڵی چاك ئەکردەوەو هەواڵی ماڵی خۆیانی بە وردی پێ ئەدان،

[1] الابريز، ١٩٨ـ ١٩٩.

[2] لەوانەیە سۆفیەکانی لای خۆمان (دینداری)و (عەقڵ) شتی وایان پێ نەڵێ، بەڵام ئەوە (منطق)ی سۆفیەکانی بۆ نموونە وڵاتی (مەغریب)ە.

نەصاراكان هاتن مەریەم‌و عیساشیان لێبوو بە (خودا) و كە وردیش ئەبوونەوە سەیر ئەكەن چ مەریەم چ عیساش بەبێ شت خوادرن ناژین، نەخۆش ئەكەون‌و ئەمرن، هاتن عەقیدەیەكی سەیریان داهێنا وەك ئەوەی رزگاریان بووبێ لەو (تناقض)ەی تێیكەوتوون، (كە خوا خوایە و بەندەش بەندەیە، خوا خولقێنەرو خولقاویش خولقاوە)، هاتن "سێ ئەقنومەكەیان" داهێنا.. كە مەریەم دایكی عیسایەو عیسا كوڕی خوایەو رۆحی خواش لە عیساو دایكیدا تیواوەتەوەو سیفەتی خوایەتی چ لە عیساو چ لە مەریەمیشدا دروست بووەو گونجاوە بڵێی هەرسێكیان خودان و كاری خواوەند ئەنجام ئەدەن **(العیاذ باللّه)**.

ئەوەی بوو بە هۆی ئەوەی نەصاراكان بەم دەردەبچن، شوێن (متشابهات) كەوتن‌و رۆچوونیان بوو لە مانا دۆزینەوەدا لە ئەو كارانەی كە عیسا پێیان هەڵدەستاو هەر لەبەرئەوەی ئەو كارانەی حەزرەتی عیسا (كە بە ئیزن و ویستی خوا ئەنجامی ئەدان) لای ئەمان كاری خواوەند بوو، گومانیان برد عیسا بووبێتە خوا، یان بووبێتە پارچەیەك لە خوا (**سبحانە** وتعالی) ئەگینا چۆن ئەو كارانەی پێ ئەكرێ، بەهەمان شێوە لەناو ئوممەتی ئیسلامیشدا كەسانێك سەیری كاری چەند پیاوێكی خواناس‌و صالحیان كرد كە كاری وایان لێ ئەوەشێتەوە كە هی خواوەندە، هەژارانە ئەو پیاوباش‌و ئەولیایانەیان لێبوو بە خواو نزیك لە خوا و گەورەتر لە صەحابە و پێغەمبەریش **(صلی اللّه علیه وآله وسلم)** كە هەموو ئەو كارانە بە ئیزن‌و ویستی خوا ئەنجامیان داوەو خوا وەك رێزێك بۆی كردوون‌و رازیش نییە زیاد لەوە ماناو مەبەست لەو ئیشانە دەربهێنرێت.

ئەگەر ئەو ئایەتانە شویهەیەكی وا دروست دەكەن ئەوە پێویستە بهێنرێنەوە بۆ ژێر ئایەتە موحكەمەكانی وەك: **(إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَاهُ مَثَلاً لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ) (الزخرف: ٥٩)، یان (أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ)**.

هۆشیارو ئاگادار بن! چ دروستكردن چ فەرمان كردن و بڕیاردان تەنیاو تەنیا هەر لە دەستی خوادایە.. یان ئەفەرموێ: **(يُدَبِّرُ الأَمْرَ مَا مِن شَفِيعٍ إِلاَّ مِن بَعْدِ إِذْنِهِ)، یان (وَاللّهُ يَحْكُمُ لاَ مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ)**. یان **(إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ)، یان (قُلِ ادْعُواْ الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِ فَلاَ يَمْلِكُونَ كَشْفَ الضُّرِّ عَنكُمْ وَلاَ تَحْوِيلاً) (الإسراء: ٥٦ )**. یان ئەفەرموێ: **(وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ لاَ يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيْءٍ إِلاَّ كَبَاسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى الْمَاء لِيَبْلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَالِغِهِ)**. ئەمانەو چەندان ئایەتی تری "موحكەم".

نموونەی سێیەم: هەندێ کاتێك کە ئەو جۆرە ئایەتانە ئەخوێننەوە کە ئەفەرموێ: **(مَن يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُ وَلِيّاً مُّرْشِداً)** (الكهف: ١٧). یان ئەفەرموێ: **(إِن كَانَ اللّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ)**، یان ئەفەرموێ: **(فَيُضِلُّ اللّهُ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ)** (إبراهيم: ٤)، دێت ئەوەندە ماناو مەبەست بار ئەکات لە وشەکانی ئەو جۆرە ئایەتانە کە بە هیچ شێوەیەك ئەو وشانە ئەو جۆرە مانایانە ناگەیەنن‌و لە مەبەست‌و ئامانجی شەریعەتی ئیسلام‌و دادو حیکمەتی خوا (عز وجل)یش دووریان ئەخاتەوە و لە کاتێکدا پێویستە ئەو ئایەتانە لە ژێر ئایەتە موحکەمەکانی وەك: **(إِنَّ اللّهَ لاَ يَظْلِمُ النَّاسَ شَيْئاً وَلَـكِنَّ النَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ)** (يونس: ٤٤ )، یان ئەفەرموێ: **(فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ)**، یان **(إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ)**، کە بە روونی باسی ئەو شتانە ئەکات کە عەبد تێیدا سەربەخۆ و ئازادە و ئەو شتانەش باس ئەکات کە کاری خوایەو پەیوەندی بە عەبدەوە نییە.

ئەم نموونانەمان بۆیە هێنایەوە تا ئەوە دەربخەین کە "موحکەم و موتەشابە" بریتین لەو دوو جۆرە ئایەتانەی کە یەکەمیان یەك مانای روون و سادە و جێگیر ئەدات و (قەرینە) چ وشەکە خۆی بێت، یان قەرینەی دەرەکی ئەیبرێتەوە، بەڵام "موتەشابە" ئەو وشانەیە کە مانای سادە و جێگیریان نییەو بە قەرینەی ئایەتی تر، یان گیانی شەریعەت یان عەقڵ و سەلیقە مانایەکی تایبەت و تەواوی پێ ئەدەیت و دوای ئەوە ئیتر دەرگا لە مانا زۆرو زەبەندەکانی تر دائەخەیت کە ئەوانە لێی دەردەهێنن کە خوای گەورە دەربارەیان ئەفەرموێ: **(فَأَمَّا الَّذِينَ في قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاء الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاء تَأْوِيلِه)**.

پێغەمبەریش (**صلى الله عليه وآله وسلم**) بە عائیشەی فەرموو: بەحەزەربە لەو کەسانەی کە خوای گەورە دەربارەیان ئەفەرموێت: **"فَأَمَّا الَّذِينَ في قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاء الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاء تَأْوِيلِه"**.[1]

ئایەتە موتەشابیهەکان کارو تایبەتمەندی زانایانن‌و پێویستە ئەوانەیان کە ریشەدارو پسپۆڕین لە زانستە شەرعییەکاندا بیانهێننەوە بۆ ژێر ئایەتە موحکەمەکان بە پێی ئەو

---

[1] رواە مسلم.

ئایەتانە تەفسیریان بکەن وەك هەرسێ نموونەی (ئەولیاکان) و (حەزرەتی عیساو مەریەمی دایکی)و (مەسەلەی قەزاو قەدەر) دا باسمان کردن.[1]

هەندێ لە زانایان چەند مەسەلەی تری وەکو (ئەسماو سیفاتی خوا) بە تایبەتی صیفەتە خەبەرییەکان و مەسەلەی لەفزی (أنا)و (نحن) کە خوای گەورە بۆ زاتی خۆی بەکاریان دێنێ لە ریزی ئایەتە موتەشابیهەکاندا باس ئەکات و بە پێویستی ئەزانێ لە ژێر ئایەتە موحکەمەکاندا راڤەو تەفسیر بکرێن.[2]

**٣- بۆچی قورئان هەموی موحکەم نییەو موتەشابیهیشی تێدایە ؟**

زانایان زۆر لەوە کۆڵیونەتەوە کە بۆچی ئایەتەکانی قورئان هەمووی موحکەم نین‌و بەو پێیە گشتییان مانای روون‌و ئاشکرایان هەبێت‌و کەس بواری ئەوەی بۆ خۆش نەبێت مانای نادروست لە ئایەتەکان دەربهێنێ، خوای گەورە بۆ رێگەی لەو کەسانە نەگرتووە کە دڵیان لادانی تێدایە و ئایەتی موتەشابیهی لە قورئاندا نەفەرمواییەو بەوشێوەیەش کەس بە دوای مانای نادروست‌و نەگونجاودا نەئەگەڕا ؟!

لەوەڵامی ئەم رەخنەیەدا زانایان ئەفەرموون:

**"ولو كان القرآن كله ظاهرا مكشوفا حتى يستوي في معرفته العالم والجاهل، لبطل التفاضل بين الناس وسقطت المحنة وماتت الخواطر".**[3]

واتە: ئەگەر قورئان هەمووی روون‌و ئاشکرا بوایە و زانا و نەزان هەردووك وەك یەك ماناکانیان بزانیبا، ئەوکاتە جیاوازی لە نێوان خەڵکدا نەئەما (ئەم زاناو ئەو نەزان) و تاقیکردنەوە کۆتایی ئەهات و خورپە و داهێنان بە تەواوی ئەمردن.

زانایان ئەفەرموون: **"مع الحاجة تقع الفكرة والحيلة و مع الكفاية يقع العجز والبلادة"**، لەگەڵ بوونی پێویستیدا بیرۆکە و هەوڵ‌و کۆشش لە دایك ئەبێت‌و لەگەڵ تێری (بوونیشدا) دەسەوسانی‌و تەمەڵی لە دایك ئەبێت. .

---

[1] سەیری: (تفسير القرآن العظيم، محمود شلتوت، ص ١٠٨و ١٠٩)، بکە کە بە جوانی ئەم پرسەی رۆشن کردووتەوەو ئێمەش نموونەکانمان لەوێ وەرگرتووە.

[2] التفسير المنير، وهبه الزحلي (٢/١٦٤).

[3] تأويل مشكل القرآن ، إبن قتيبة، ص٨٦.

له یه‌كێكیان پرسی بۆچی خۆزگه به‌وه‌ناخوازێت بگه‌یته سنووری كیفایه‌ت و تێری، وتی: حه‌زم له خوو ئه‌خلاقی ته‌مه‌ڵ و ده‌سته‌وسانه‌كان نییه!

هه‌ر زانایان ئه‌فه‌رموون: "هه‌رچی زانیاری هه‌یه چ زانیارییه ئاینییه‌كان و چ زانیارییه مرۆییه‌كان به‌شێكیان زانیاری سه‌ره‌تایین‌و به‌شێكیان زانیاری وردو قورسن، قوتابی له زانیارییه سه‌ره‌تاییه‌كانه‌وه هه‌نگاو به هه‌نگاو سه‌رئه‌خرێت به‌ره‌و زانیارییه ورد و قورسه‌كان و ئه‌وه‌شه وائه‌كات مامۆستاكان فه‌زڵیان ببێت به سه‌ر قوتابییه‌كاندا". [1]

هه‌ر زانایان ئه‌فه‌رموون: **ولوكان كل فن من العلوم شيئاً واحداًلم يكن عالم ولا متكلم ولا خفي ولا جلّي، لأن فضائل الأشياء تعرف بأضدادها"**. [2]

واته: ئه‌گه‌ر هه‌موو جۆره‌كانی زانست‌و زانیاری یه‌ك شت بوونایه، ئه‌وكاته مامۆستاو قوتابێتی نه‌ئه‌ماو نادیارو دیار له‌و زانستانه‌دا نه‌ئه‌ما، چونكه گه‌وره‌یی هه‌موو شتێك له پێچه‌وانه‌كه‌یدا ده‌رئه‌كه‌وێت.. واته فلاّن كه‌س له شته وردو قورسه‌كانی فلاّنه زانستدا ئاگاداره گه‌وره‌یی زیاتر ده‌رئه‌كه‌وێ له‌و كه‌سانه‌ی تر كه ته‌نیا شته گه‌وره‌و ئاسانه‌كانی ئه‌و زانسته ئه‌زانن.

زه‌مه‌خشه‌ریش كه گه‌وره موفه‌سیری موعته‌زیله‌كانه ئه‌ڵێت: **(فان قلت: فهلاّ كان القرآن كله محكما؟ قلت: لوكان كله محكما لتعلق الناس به لسهولة مأخذه ولأعرضوا عما يحتاجون فيه الى الفحص والتأمل من النظر والأستدلال.."**. [3]

له‌مانه‌وه ئه‌گه‌ینه ئه‌وه‌ی كه بێحكمه‌ت نییه خوای گه‌وره كتێبه‌كه‌ی خۆی بكاته دوو به‌شه‌وه "موحكه‌مه‌كان‌و موته‌شابیهه‌كان"، تا ڕێز و پله و پایه‌ی زانایان ده‌ربخات و كاری گه‌وره و پڕ مه‌ترسییان بخاته سه‌رشان كه بریتییه له هێنانه‌وه‌ی موته‌شابیهه‌كان بۆ ژێر موحكه‌مه‌كان و له ژێر ڕۆشنایی ئه‌واندا مانا وردوو قورسه‌كانی لێده‌ربهێنن و نه‌یه‌ڵن خه‌ڵكانێك كه (زه‌یغ)و (ئینحراف) له دڵیاندا هه‌یه قسه‌ی خواو پێغه‌مبه‌ری خوا بكه‌نه به‌ڵگه‌ی ده‌ستیان بۆ سه‌رگه‌ردان كردنی خه‌ڵكی‌و به‌تاڵ كردنه‌وه‌ی دینه‌كانی خوا، وه‌ك نه‌صاراكان هه‌ندێ ئایه‌تی قورئانیان ئه‌كردی به‌ڵگه بۆ خوایه‌تی عیسا و مه‌ریه‌می دایكی

---

[1] هه‌مان سه‌رچاوه، ص٨٧.

[2] هه‌مان سه‌رچاوه ص ٨٧.

[3] الكشاف، ص٢٥٩.

یان وەك دەستە گومڕا و لادەرەکان کە بە شوێن ئایەتە موتەشابیهەکاندا ئەچن ڕێبەرو گەورەکانی خۆیان لە خەڵکی ئەکەنە ئەولیا و ئەنبیا و شەڕی خوێناویشی لەسەر ئەکەن و ئەو رایە موتەشابیهانە ئەکەنە پێوەر و ترازوو بۆ خەڵکی، ئەوەی رای وەکو ئەوان بوو دۆستو خۆشەویستەو ئەوەشی رای وەك ئەوان نەبوو ئەوە پیس و نەگریسە وەك جاران ئەیانوت: "من كان معي فهو قديس ومن كان مع غيري فهو ابليس".

لەلایەکی تریشەوە بوونی ئەو موتەشابیهانە لە قورئاندا دەرگای لێکۆڵینەوە لە زانایان و خەڵکی ئەکاتەوە و یامەتی عەقڵەکان ئەدات بجوڵێن و ئیجتیهاد بکەن، هەر ئەو لێکۆڵینەوە و ئیجتیهاد کردنەیە وای کردووە لەناو کەلەپوری ئیسلامییدا مەسەلەیەك نەمێنێ زانایانی ئیسلامی بە ڕێگەیەك یان زیاتر قسەو باسیان لێی نەکردبێ، خۆ ئەگەر قورئان هەمووی موحەکم و وشەی سادە بوایە وەك "ئیبن قوتەیبەو زەمەخشەری" فەرمویان ئەوە عەقڵەکان دۆگما ئەبوون و بواری جوولەو گەشەکردنیان کەم ئەبویەوەو گەورەو بچوکی ئوممەتی ئیسلامی لە یەك ئاست و یەك پلەدا ئەمانەوەو دنیا لە ناو خۆیاندا گرۆمڵەی ئەکردنو لە گۆشەیەکی تەسك و تایبەتدا قەتیسی ئەکردن.

٤ـ ئایا ڕاستە قورئان هەمووی موتەشابیهە؟

بەڵێ، ڕاستە قورئان لە شوێنێکدا خوای گەورە هەمووی ناو ئەنێ "موحکەم" و لە شوێنێکی تریشدا هەمووی ناو ئەنێ "موتەشابە"، بۆ نموونە ئەفەرموێ: (كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ). لە شوێنێکی تردا ئەفەرموێ: (كِتَاباً مُّتَشَابِهاً مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ). کەواتە خوای گەورە هەموو ئایەتەکانی قورئانی لە ئایەتەکەی سورەتی (هود)دا ناوناوە (موحکەمات) و لە ئایەتەکانی سورەتی (زمر)یشدا هەموو قورئانی ناو ناوە "موتەشابیهات".[1]

ئەمە چۆن وایەو مەبەست چییە لەم ناوانە؟ زانایان ئەفەرموون: "موحکەم" واتە شتی مەحکەمو بێ عەیب کەواتە قورئان هەموی مەحکەم و بێ عەیبە، "موتەشابیه"یش یانی لە ڕاستیو جوانیدا و لە فۆرمدا لە یەکتری ئەچن، دەی ئایەتەکانی قورئان لە ڕاستی و لە شکل و جوانیدا هەموویان لەیەك ئەچن، کەواتە هیچ جیاوازی و دژایەتییەك لە مەدا نییە ئەوە ڕوانینێك..

---

[1] سەیری تفسير الجلالين ، ص٥٢، هەروەها تفسير المنير، وهبه الزحيلي (١٥٨/٢) بکە.

روانینێکی تریش ئەوەیە ئەو موتەشابیهەی کە خەڵکی سادەو ریشەدار وائەزانن موحکەم نییە و چاك فۆرم و ناوەرۆکی دانەرێژراوە و ورد نەکراوەتەوە و لەرزۆکە، ئەوە با بزانن ئەو ئایەتەش هەر لە ئایەتە موحکەمەکان ئەچن و وەك ئەوان مەحکەمکراون و لە ژێر رۆشنایی ماناکانی ئەواندا ئەمانیش هەر موحکەمن و ماناکانیان پتەوەو بێکەموکوڕییە و خەتای سادەیی ئەو خەڵکانەیە کە بیریان قووڵ نییەو بە ناو مانا و مەبەستەکاندا شۆڕنابنەوە.

ئیمامی بوخاری لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ریوایەت ئەکات کە وتوویەتی: کابرایەك هاتە لای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و وتی: "ئەرێ قوربان!" من هەندێ ئایەت ئەخوێنمەوە لە قورئاندا لێم تێکەڵ ئەبێت "چی بکەم" عەبدوڵڵا فەرموی" وەکو چی؟ کابرا وتی **(فلا انساب بینهم یومئذ ولا یتساءلون)** هەیە و خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ **(واقبل بعضهم علي بعض یتساءلون)**, هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێ **(ولا یکتمون الله حدیثا)** کەچی لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ **(والله ربنا ماکنا مشرکین)** ئەوەتا ئەو شیرکەیان لە خوا ئەشارنەوە.

ئیبن عەبباس فەرموی: ئایەتی "فلا انساب بینهم" لە نەفخەی یەکەمدایە کە ئەکرێ بە "صور"دا، ئەوکاتەی کە فوو ئەکرێت بە "صور"دا هەرچی لە زەوی و ئاسمانەکاندایە ئەمرن, ئەوانە نەبێت کە خوا ئەیەوێ جارێ بمێنن ئا لەوێدا **"فلا انساب بینهم یومیذ ولا یتساءلون"**, پاشان فووی دووەم ئەکرێتەوە بە( صور)دا خەڵکی زیندوو ئەبنەوە و لەوێدا دەست ئەکەنە پرسیار کردن لە یەکتری ئەو دوو ئایەتەش کە فەرموی (ماکنا مشرکین) و لەو لاشەوە ئەفەرموێ **(ولا یکتمون الله حدیثا)** هۆکەی ئەوەیە کە خوای گەورە لە خەڵکانی دڵسۆز و خاوەن دین ئەبورێت, موشریکەکان ئەڵێن وەرن با ئێمەش بڵێن: ئێمەش "موشرك" نەبوین, خوای گەورە مۆر ئەدات لە دەمیان و ئەندامەکانی لەشیان شایەتی لە سەر کردەوەکانیان ئەدەن و لەوێدا حاڵی ئەبن کە کەس ناتوانێ شت لە خوای گەورە بشارێتەوە و ئەو کاتە کافران خۆزگە ئەخوازن کە ئەوانیش موسڵمان بوونایە.[١]

---

[1] ریوایەتەکە چەندین مەسەلەی تێدایە کە لەو کابرایە تێکەڵ بوە و( ئیبن عباس)یش هەموویانی بۆ ڕاست ئەکاتەوە ئێمە هەر بە کورتی گواستمانەوە (التفسیر المنیر: ٢/١٦٨).

**٥ـ كەواتە لۆمە كراو كێیە؟**

خوای گەورە لۆمەی ئەو کەسانە ئەکات کە بە دوای موتەشابهاتدا ئەڕۆن و ئێوەش ئەڵێن: ئەوە گەورەییە بۆ زانایان کە لە ئایەتە موتەشابهەکان وورد ئەبنەوە و مانای دروستی لیێ دەر ئەهێنن, جا كەواتە لۆمە كراو كێیە لە ئایەتەکەدا ؟.

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە ئەفەرمویێت: (**ولم يقل الله في المتشابه لا يعلم تفسيره و معناه الا الله, و انما قال: و ما يعلم تاويله الا الله) و هذا هو فصل الخطاب بين المتنازعين في هذا الموضع فان الله اخبر انه لايعلم تاويله الا هو... ولكنه لم ينف علمهم بمعناه و تفسيره بل قال: كتاب انزلناه اليك مبارك ليدبروا آياته: و هذا يعم الآيات المحكمات و الآيات المتشابهات, وما لا يعقل له معنى و الله و رسوله انما ذم من اتبع المتشابه ابتغاء الفتنة و ابتغاء تاويله فاما من تدبر المحكم و المتشابه كما امره الله وطلب فهمه و معرفة معناه فلم يذمه الله بل امر بذالك و مدح عليه"**[١] أ. هـ.

"**قسطلانی**"یش ئەفەرمویێ: "**ليفتنوا الناس عن دينهم لتمكنهم من تحريفها الي مقاصدهم الفاسدة كاحتجاج النصارى بان القرآن نطق بان عيسى روح الله و كلمته و تركوا الاحتجاج بقوله ان هو الا عبد انعمنا عليه وأن مثل عيسى عندالله كمثل آدم خلقه من تراب وهذا بخلاف المحكم فلا نصيب لهم فيه لأنه دافع لهم وحجة عنهم**".[٢]

کەواتە وردبوونەوە لە قورئان کارێکی داواکراوە لەشەرعداو کارێکی گەورەشە، ئەو وردبوونەوەو شۆڕبوونەوە بۆ ناو ماناکانی ئایەتەکان چ لە ئایەتە موحەکەمەکاندا بێت یان لە ئایەتە موتەشابیهەکاندا بێت، نەك زەمکراو نییە، بەڵکو مەدحکراویشە، ئەوەشی لۆمەکراوە وەك **قسطلانی** لەسەرەوە فەرمووی ئەوەیە بە دوای تەئویلو مانایەکدا بگەڕێت کە فیتنەیەکی پیێ دروست بکات لەناو موسڵمانان‌دا، یان پێچەوانەی ئایەتە موحکەمەکان بێت، یان پێچەوانەی حەدیسی ـ صحيح ـ بێت، یاخود پێچەوانەی بنەماکانی زمانی عەرەبی بێت، یان بەبێ هۆو ـ مورەجیح ـ باوی مانایەك بدات بەسەر مانایەکی تردا.[٣]

---

[1] دقائق التفسير (٩٧/١)ط، دار الانصار، پەراوێزی: النبذ في اصول الفقة/ ابن حزم/ ص١٠٢

[2] ارشاد السارى القسطلاني، ٥١/٧. ط١ / ١٤١٠، مطبعة الذهيي للنشر والتوزيع.

[3] دەستەی قادیانەکان ئێستا دیارترین دەستەو تاقمن کە پەنا بۆ ماناکردنی نادروستی موتەشابهات ئەبەنو قەناعەتو ئاینێکی تایبەت و سەربەخۆیان دروست کردوە کە پێچەوانەیە لەگەڵ شتە نەگۆڕەکانی شەریعەتداو دژە

بۆ نموونە: سەرانی موعتەزیلە بەردەوام بۆ ئەو ئایەتانە ئەگەران لە قورئاندا کە ئەو مانانەی لێوەردەگیرێ کە (خوا نابینرێت، قورئان مەخلوقە، قەزاو قەدەر نییە، کەسێ گوناهی کەبیرە بکات نەموسڵمانەو نە کافرە، بەڵکو لەو نێوانەدایە، (حوسنو قوبح) دووشتی عەقڵینو بە عەقڵ ئەزانرێت نەك بە شەرع)، چونکە ئەو شتانەیان کردبوویە بناغەی مەزهەبەکەیانو ئەیانوویست بیشەرعێنن!

(واصڵی کوڕی عطا) کە بۆ یەکەمین جار لە چڤاتەکانی حەسەنی بەصری گەورە تابیعی جیابوویەوەو بەردی بناغەی بۆ (ئیعتزال) دانا "کە شەوی لێ ئەهات رووی ئەکردە قیبلەو دەستی بە نوێژکردن ئەکردو قەڵەمێك و چەن لاپەڕە کاغەزیشی لە پێش خۆیەوە دادەنا و دەستی بە قورئان خوێندن ئەکرد کە ئەگەیشتە ئایەتێك بەڵگە بوایە بە دەستییەوە بۆ بۆڕدانی بەرامبەرێکی دائەنیشت و ئایەتەکەی ئەنووسی و ماناکەی خۆی لێدەر ئەهێنا و دیسان دەستی بە نوێژەکە ئەکردەوە" [١]

لە "بیشری میرسی"یەوە ئەگێڕنەوە کە ڕێبەرایەتی فیتنەی "خەلقی قورئان" ئەکرد ووتویەتی: **"لیس شيء أنقض لقولنا من القرآن, اذا احتجوا عليكم بالحديث فغالطوهم بالتكذيب, و اذا احتجوا بالآيات فغالطوهم بالتاويل"** . [٢]

هیچ شتێك نییە وەك قورئان قسە و بنەماکانی ئێمە خاو بکاتەوە, بۆیە هەرکەس بە حەدیس موناقەشەی کردن بەوە بە هەڵەیدا بەرن بڵێن ئەو حەدیسە صەحیح و راست نییە, ئەگەر بە ئایەت موناقەشەی کردن بەوە بە هەڵەیدا بەرن بڵێن ئەوە ماناکەی بەو شێوەیە نییە تۆ ئەیڵێی و تەئویلەکەی بەم شێوەیەیە..!!

هەر ئەمانە بوون کە یەك جار لە مێژوودا بۆیان ڕێکەوت دەسەڵات بگرنە دەست نەیانتوانی لەگەڵ نەیارەکانیاندا موسڵمانانە و عاقڵانە بجولێنەوە, ڕێگەیان نەدا کەس جیاواز لە ئەوان بیر بکاتەوە, نەیانتوانی ڕای بەرامبەر قەبوڵ بکەن یان بێن بە "فکر" و "عەقڵ" موناقەشەیان بکەن، بەڵکو هاتن بە زیندانی و شکەنجە و کوشتن ڕووبە ڕووی

---

بە گیانی ئیسلامەتی، نەخشەی کتێبێکی رەخنەییمان ئامادەیە بۆ هەڵسەنگاندنی دیدو بیرو مێژووی قادیانەییەکانو خوا یار بێت کاری جدّی لەسەر ئەکەین تا زوو بکەوێتە بەر دیدی خوێنەران..

[1] دراسات في الفرق و العقائد الاسلاميه, عرفان عبدالحميد، ص١٠٥.

[2] مجلة البيان ـ عدد" ٩٦" شعبان، ١٤١٦ـ ص١٢.

ئەوانە بوونەوە کە ڕایان لە ڕایەکانی ئەمان نەبوو, لە دوایشدا هەر ئەهلی سونەت و جەماعەت بە "فکر" و "موناقەشەی فیکری" تێکیان شکاندن و ئابڕووی بیروڕا نازانستییەکانی ئەمانیان برد و لە دەسەڵات دووریان خستنەوە و موناقەشەکانی ئیمام **عبدالعزیز الکنانی المکي** لە کتێبی **"الحیدة"**دا لەگەڵ **"بشری مریسی"** و سەرانی موعتەزیلە دا شایەتی ئەوەن ئەهلی سوونەت بە چەکی فکرو "موعتەزیلە"ش بە چەکی تۆقاندنو دەسەڵات مامەڵەیان لەگەڵ مەسەلە زانستیو مەنتقییەکاندا کردووە".[1]

## باسی نۆیەم: زانستی (أسباب النزول)

ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز هەندێکیان بە هۆیەکەوە و هەندێکی تریان بەبێ هۆ دابەزیوونەتە خوارەوەو دەستی کردووەتە دامەزراندنی باڵەخانەی بیروباوەڕو شەریعەتی ئیسلامی.

جاری وا هەبووە کە ڕووداوێك، یان پرسیاری کەسێك، یان پێشنیاری صەحابەیەك، یان سەرپێچی یەکێك بووەتە هۆو ئایەت دابەزیوە بۆ ڕوونکردنەوەو وەڵامدانەوەی دروستی ئەو مەسەلەیە. لەبەرئەوەیە کە پێناسەی (سبب النزول) ئەکرێت ئەوترێ: **"هو مانزل القرآن من شأنه وقت وقوعه کحادثة او سؤال"**.[2] واتە: هۆی دابەزین ئەوەیە کە قورئان لە کاتی ڕوودانی ئەو شتەدا یان کردنی ئەو پرسیارەدا هاتبێتە خوارەوە.

## گرنگی زانینی "أسباب النزول":

زانایانی ئیسلامی لە کۆندا گرنگی زۆریان بەم زانستە قورئانییە داوەو چەندین زانا کتێبی تایبەتی لەسەر داناوە، لەوانە: (علی المدینی) کە شێخی ئیمامی بوخاری بووە. پاشان (واحیدی) کە لە زانایانی سەدەی چوارەمی کۆچییەو دروست لە ساڵی (٤٢٧) کۆچی دا مردووە، پاش ئەمانیش **"جەعبەری"** کە ساڵی **٧٢٢**ی کۆچی وەفاتی کردووە و خاوەنی

---

[1] کتێبی "الحیدة" عبدالعزیز لکناني المکي، هەریەك لە ئیبن تەیمیەو ئیمامی شاطیي باسی دەکەن و پەسەدجیدەی خۆیانی بۆ دەربڕن، ئەم کتێبە بە ڕوونی دەری ئەخات کێ ئەهلی فیکرو عەقڵە، موعتەزیلە، یان ئەهلی سونەتو جەماعەت؟

[2] مباحث في علوم القرآن ، ص٧٤.

چەند کتێبێکی گرنگە لە "**علوم القرآن**"دا لەوانە کتێبی: (**روضة الطرائف في رسم المصاحف**)و (کنز المعنی) کەراڤەی کتێبی (**الشاطبية فی القراءات**)ەو کتێبەکەی (واحدی) کورت و پوخت کردووەتەوە رشتەکانی لە ریواتەکان کردوەتەوە و تەنیا (دەق)ەکانی هێشتوەتەوە، پاش ئەمانەش شێخی ئیسلام "**ئیبن حەجەری عەسقەلانی** کە ساڵی **٨٥٢** کۆچی وەفاتی کردووە، دەستی دایە نووسینی کتێبێك بە ناوی (أسباب النزول)، ئیمامی **سیوطی** ئاماژە بەوە ئەکات کە بەرگێکی لەو کتێبە بینیوە، بەڵام هەموو کتێبەکەی چنگ نەکەوتووەو پاش ئەمانیش ئیمامی **سیوطی** خۆی کتبیبێکی گەورەی لە (أسباب النزول)دا داناوە بەناوی (لباب المنقول فی أسباب النزول).[١]

## سودەکانی زانینی (أسباب النزول):

زانایان هەریەکەو بە پێی رادەی سەرسامبوونی بەم زانستە، باسی لە سودەکانی زانینی (أسباب النزول) کردووە، لەو سودانە:

**١ـ** یارمەتی موفەسیر ئەدات بۆ دەرهێنانی مانای شیاوو گونجاو بۆ ئایەکە. (ئیبن دەقیق ئەلعید) ئەڵی: "**بيان سبب النزول طريق قوي في فهم معاني القرآن**".[٢] ئیبن تەیمیەش ئەڵێت: "**معرفة سبب النزول يعين على فهم الآية فان العلم بالسبب يورث العلم بالمسبب**".[٣]

بۆ نموونە ئیمامی بوخاری ریوایەت ئەکات کە مەروانی کوڕی حەکەم جارێکیان ئەم ئایەتەی ئەخوێندەوە کە ئەفەرموێ: (**لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ**) (آل عمران: **١٨٨**). ئایەتەکە یانی: با ئەو کەسانەی دڵخۆشن بەو شتەی کە پێیان دراوە و حەز ئەکەن مەدحبکرێن لەسەر شتێك کە ئەوان نەیانکردووە باوا نەزانن کە لە سزای خوا رزگاریان ئەبێت و بابزانین کە سزایەکی بە ئازاریان بۆ دانراوە.

---

[1] بۆ ئەم زانیارییانە سەیری سەرچاوەی پێشوو (ص٧١ـ ٧٢) بکە.

[2] هەمان سەرچاوی پێشوو ل٧٦.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٧٦.

مەروان بە دەرگاوانەکەی خۆی وت: ئەی رافع بچۆ بۆ لای ئیبن عەباس‌و پێی بڵێ: جا ئەگەر بێتو هەریەك لە ئێمە دڵخۆشی دەربڕی بەوەی پێی دراوەو حەز بکات خەڵکی مەدحیشی بکات لەسەر شتی کە ئەو نەیکردووە، کەواتە هەمووومان تووشی سزای سەخت ئەبین، ئیبن عەباس ئەفەرموێ: دەی ئێوە چ پەیوەندییەکتان بەو ئایەتەوە هەیە؟ ئەو ئایەتە لەسەر هەڵسوکەوتی جولەکەکان دابەزی، پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** پرسیاری مەسەلەیەکی لێکردن، ئەوانیش ئەو وەڵامەیان لێ شاردەوەو شتێکی تریان پێ وت لەباتی ئەو مەسەلەیە، کە لای پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** دەرچوون وایان پیشان ئەدا کە وەڵامی پێغەمبەریان **(صلى الله عليه وآله وسلم)** بەراستی داوەتەوەو داوایان کرد کە سوپاس بکرێن لەسەر ئەوەو مەدح بکرێن، دڵیان بەوە زۆر خۆش بوو کە راستی مەسەلەکەیان لە پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** شاردوەتەوە، خوای گەورەش پێغەمبەری بەم ئایەتە ئاگادار کردووە لەو تەڵەکەبازییەی جولەکەکان.[1]

٢- زانینی "سبب النزول": موفەسیر فێری ئەوە ئەکات کە "خاص" لە "عام" جیابکاتەوە بۆ نمونە ئەو رووداوەی سەرەوە کە ئایەتەکە لە صیغەی "عموم"ەوە بۆ صیغەی "خصوص" ئەگوازێتەوە، واتە تایبەتی ئەکات بە کافرانی ناو جولەکەوە.

٣- زانینی (سبب النزول): ئەو سودەی هەیە کە جیاوزای نێوان زانایان ئاسان ئەکاتو رێگە بۆ رزگاربوون لەو جیاوازییە ئەدۆزێتەوە، بۆ نموونە ئایەتی: **(إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ * يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ * يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ اللَّهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ)** (النور: ٢٣- ٢٥). لەم ئایەتەدا دەرئەکەوێت کە ئەو کەسانەی (قەزف)ی ئافرەتە ئیمانداره پاکداوێنە بێئاگاکان ئەکەن نەفرینلێکراون لە دونیاو ئاخیرەتداو تۆبەیان بۆ نییە. کەچی ئایەتێکی تر ئەفەرموێت: **(وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ * إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ)** (النور: ٤- ٥). لێرەدا دەرگای تەوبە کراوەتەوە، زانایان ئەفەرموون: ئەوەی یەکەمیان دەربارەی (قەزف)ی

[1] لباب المنقول في أسباب النزول، السيوطي، پەراوێزی "مفردات القرآن المجيد، محمد الحمصي، ص١١٢".

حەزرەتی عائیشەو دایکانی ئیمانداران هاتوەتە خوارەوە کە تۆبەیان بۆ نییە، بەڵام ئەمەی تریان (عام)ەو ئەو (خاص)ە پێشووی هەر تێدا ئەمێنێتەوە، چونکە وەك زانایان ئەفەرمون: **(ان دخول صورة السبب في اللفظ العام قطعي، فلا يجوز اخراجها بالاجتهاد لانه ظني)**و ئەمەش بەناوی جمهوری زانایانی ئیسلامییەوە ئەگێڕنەوە.[١]

٤ـ بەهۆی (أسباب النزول)ەوە لە حیکمەتەکانی ئەم شەریعەتی ئیسلامە حاڵی ئەبین، کە چۆن قۆناغ قۆناغ تاکی موسڵمانو کۆمەڵگەی ئیسلامی پەروەردە ئەکاتو پێیان ئەگەیەنێت، کە دیارترین نموونە لێرەدا بریتییە لە **"**حەرامکردنی عارەق بە چوار قۆناغ**"**.

٥ـ بە زانینی (سبب النزول)، دەرگای ئەو تەئویلە گەندەڵانە دائەخرێت کە بۆ هەندێ ئایەت ئەکرێت لەلایەن توندەرەوەکانی ڕێبازە لادەرەکانەوە، بۆ نمونە (شیعە مەزهەبەکان) یان (خەواریجو ناصیبیەکان).

٦ـ وەڵامی ئەو وەهمە ئەداتەوە کە بۆ هەندێك دروست ئەبێت، گوایە فلانە ئایەت تایبەتە بە فلانە کەسو فلانە پرسەوەو ناکرێ مانای تری ببرێت بەسەردا.

٧ـ ناسینی ئەو کەسانەی کە ئایەتەکان لەسەریان هاتۆتە خوارەوە، بۆ ئەوەی نە تاوانبار بێتاوان بکرێتو نە بێتاوانێکیش تاوانبار بکرێت.

٨ـ زانینی (سبب النزول) هاوکاری قورئان خوێن ئەکات کە ئاسانتر قورئان لەبەر بکات، چونکە قورئان خوێن کە یاساو حوکمەکانی پەیوەست کرد بە ڕووداو کەسەکانەوە زووترو زیاتر حزور پەیدا ئەکەن و ئاسان بۆی لەبەر ئەکرێت.[٢]

٩ـ زانینی (أسباب النزول) وێنەیەکی ڕوونو ئاشکرای کۆمەڵگەی پێغەمبەرمان **(صلى الله عليه وآله وسلم)** پێ ئەدات کە چۆن مامەڵەیان لەگەڵ ئەم دینو قورئانو پێغەمبەرەدا **(صلى الله عليه وآله وسلم)** کردووە، صەحابە چەند بەرەوشت بوون لەگەڵ پێغەمبەردا **(صلى الله عليه وآله وسلم)**و جوولەکە و دووڕووەکان و خەڵکی کافریش چەندێ بێشەرمو نەفام بوون لەگەڵیدا.

---

[1] مباحث في علوم القرآن، ص٧٥.

[2] بۆ ئەم خاڵانە سوود لە هەردوو سەرچاوەی (مناع القطان، مباحث في علوم القرآن، ص٧٠ـ ٩٤) و (أحمد عادل كمال علوم القرآن ص٣٨) وەرگیراوە.

قورئان خوێن و ئەوەی لێکۆڵینەوەی قورئان بکات بۆی دەرئەکەوێت کە کۆمەڵگە بەشەرمییەکان هەر هەمان کۆمەڵگەن چەندە زەمەن دووربکەوێتەوە لەیەکتری.

ـ کۆمەڵگەی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) پرسیاری هەرچییان کردبێت دەربارەی (خوا)و (غەیب)و (دین)، ئێستاش هەمان پرسیار ئەکرێتەوە..

* (**أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ * أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ**) (**الطور: ٣٥ـ ٣٦**)

* (**وَيَسْتَنبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ وَمَا أَنتُمْ بِمُعْجِزِينَ**) (**يونس : ٥٣** ).

* (**يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنفَالِ**)... (**يَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ**)... (**يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَهِلَّةِ**)... (**يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ**)... (**يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ**)... (**وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ**) (**البقرة: ١٨٦**).

ـ ئەو رادەی هێزو لاوازییەی لەو جۆرە کەسانەدا بوون لەو کۆمەڵگەیەدا ئێستاش هەمان هێزو لاوازی هەیەو خوای گەورە بە هەمان شێوە ئەمان دوێنێو ئەرکیان لەسەردائەنێ وەك چۆن لەسەر ئەوانی داناوە.

* (**وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفاً**)... (**لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا**)...

* (**وَلاَ يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلاَ شَهِيدٌ**) (**البقرة: ٢٨٢**)... (**إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ**) (**النساء: ٣١**)..

* (**إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاءُ**) (**النساء: ٤٨**).

ـ لێکۆڵینەوە بە هۆی زانینی (أسباب النزول)ەوە لەوەش ئاگادار ئەبێ کە ململانێی هێزەکانی ناو کۆمەڵگەی ئێستاش هەر بەشێکە لەو ململانێیەی کە لە کۆمەڵگەی پێغەمبەردا (**صلى الله عليه وآله وسلم**) هەبووەو تەنیا جۆری ژیان جیاوازی هەیە.

* موشریکەکانی ناو مەککە ئەیانووت: (**أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهاً وَاحِداً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ**) (**صـ: ٥**).

* یان ئەیانوت: (**إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ**) (**صـ: ٦**). بەم بانگەشە ئاینییەی مەبەستی شتی تری هەیە.

* جولەکەکان بە موشریکەکانیان ئەوت: (**هَؤُلاء أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُواْ سَبِيلاً**) (**النساء: ٥١**). ئێستاش جولەکەو گاور هەروا بە بەرەی دین ئەڵێن.[1]

**١٠-** سودێکی پەروەردەیی گەورە هەیە لە زانینی (أسباب النزول)دا ئەویش ئەوەیە ئەوانەی وانەی ئیسلامی ئەڵێنەوە لەبری ئەوەی پەنا بۆ پێشەکییەکی گونجاو بە مانای ئایەتەکە ببەن کە سەرنجی قوتابیانی پێ ڕابکێشن‌و رۆحییاتیان ئامادە بکەن با ئەو رورداوەیان ئەو پرسیارەی کەبووەتە (سبب النزول) باس بکەن و ئەو ئەنجامە دەست ئەخەن و سەرنجی قوتابییەکان رادەکێشن.

## هەندێ وردە تێبینی لەسەر مەسەلەی (أسباب النزول)دا:

یەکەم: تەسککردنەوەی مەیدانی ماناکردن بە بیانووی (سبب النزول)ەوە کارێکی نادروستە. هەندێ کەس لە زاناو لە نازانا ئەوەندە رووبەری (أسباب النزول) فراوان دەکات کە بوار لە خۆشی و لە خەڵکی تریش تەسك ئەکاتەوە نایەڵێ ئەو حیکمەت و بەخششە زۆرەی کە لە ناو ماناکانی قورئاندا هەیە تووشی خەڵکی ببێت بە بیانووی ئەوەی گوایە ئەم ئایەتە لە مانا (عام)ەکەی کەوتووەو تازە ئەو مانا (خاص)ەی هەیە.

بۆ ئەو بەرێزانەو بۆ خۆشمان ئەڵێین:

**١-** ئایەتەکانی قورئان بیکەیتە سەد بەشەوە کەمتر لە(١٪)ی "اسباب النزول"ی هەیە, چونکە وەك زانراوە ئایەتەکانی قورئان زیاتر لە شەش هەزار ئایەتن و ئەوەش **سیوطی** بۆ نموونە لە (لباب المنقول)دا هۆی دابەزینی بۆ باس کردوون کە تەنیا (**٥٣٩**) ئایەتە، لە گەڵ ئەوەدا کە سەد و یەك قسە لە سەر سەنەدی ئەو ریوایەتانە هەیە و هەندێکیان (مەوضوع)، یان (**ضعیف**)ن و بە دەگمەن (حسن) و (صحیح) یان لێدەردەچێت:

***-** "دە" جوزئی یەکەمی قورئان لە سوورەتی" **الفاتحة**"ە وە دەست پێ ئەکات تا سوورەتی (یونس) بریتییە لە (٨) سوورەت و (١٣٥٧) ئایەت کەچی تەنیا (**٢٢٣**) ئایەت (سبب نزول)ی بۆ باس کراوە.

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم خاڵی نۆیە سەیری (في ظلال القرآن) تەفسیری سورەتی (التوبە) بە تایبەت ئایەتەکانی پەنجا بەداوە بکە.

*ـ ده (جوزئی) دووه‌می قورئان كه له سووره‌تی (یونس)ه‌وه ده‌ست پێ ئه‌كات تا سووره‌تی (الروم)، بریتییه له (١٨) سووره‌ت و (٢٠٤٥) ئایه‌ت، كه‌چی ته‌نیا (١٠٧) ئایه‌تی (سبب نزول)ی بۆ باسكراوه.

*ـ ده جوزئی سێیه‌می قورئان كه له سووره‌تی (الروم)ه‌وه ده‌ست پێ ئه‌كات تا كۆتایی قورئان، بریتییه له (٧٢) سووره‌ت و (٢٨٠٧) ئایه‌ت، كه‌چی ته‌نیا (٢٠٩) ئایه‌ت (سبب نزول)ی بۆ باسكراوه.

كه‌واته له كۆی سی (٣٠) جوزئی قورئان كه (١١٤) سووره‌ت و(٦٢٠٩) ئایه‌ته ته‌نیا (٥٣٩) ئایه‌تی باسی (سبب نزول)ی كراوه، ئه‌مه‌ش یانی (٥٦٧٠) ئایه‌تی قورئان باسی (سبب نزول)ی بۆ نه‌كراوه و ئه‌وه‌ش یانی له دوانزده به‌ش یه‌ك به‌شی ئایه‌ته‌كان (اسباب نزول)ی هه‌یه و ئه‌و ڕێژه‌یه‌ش شتێكی زۆر كه‌مه و ئه‌وه نایه‌نێ زانایه‌ك یان نازانایه‌ك به‌ربه‌ست له تێگه‌یشتن له‌م قورئانه و ئایه‌ته‌كانی ئه‌م قورئانه‌دا دروست بكات و عه‌قڵی ئیسلامی توشی دۆگمایی و نه‌زۆكی بكات.

٢ـ ئه‌و (اسباب نزول)انه ئه‌گه‌ر بنه‌ماكانی زانستی (جرح و تعدیل)یان به‌سه‌ردا جێبه‌جێ بكه‌ین پێ ناچێ له‌و (٥٣٩) ڕیوایه‌ته، دوو سه‌دیان بچنه پله‌ی (صحیح)ه‌وه، چونكه بۆ نمونه چیرۆكی (غه‌رانیق) كه **سیوطی** هێناویه‌تی له ناو ئه‌و ڕیوایه‌تانه‌دایه كه به بڕیاری هه‌موو زانایانی ئیسلام ئه‌و چیرۆكه هیچ بناغه‌یه‌كی نییه و پێچه‌وانه‌ی ئه‌لفای ئیسلامه‌تییه كه دینی (یه‌كتاپه‌رستی)یه و جه‌نگێكه دژ به شیرك و بتپه‌رستی.

٣ـ زانایانی ئیسلام هه‌ر له كۆنه‌وه ئه‌وه‌یان فه‌رمووه **(العبرة بعموم اللفظ لابخصوص السبب)**، ده‌ی ئیتر بۆچی ئه‌بێ (سبب نزول) بكه‌ینه به‌ربه‌ست له به‌رده‌م تێگه‌یشتنێكی ڕاست و دروستی تازه‌دا كه ئاسۆی بیركردنه‌وه فراوان ئه‌كات و ئه‌م دینه‌ش به‌ره‌و پێشتر ئه‌بات.

٤ـ زانایانی ئیسلام مه‌رج و پێوه‌ری زۆریان داناوه بۆ وه‌رگرتنی ڕیوایه‌ته‌كانی (اسباب نزول) له‌وانه (واحیدی) كه زۆر لۆمه‌ی زانایانی سه‌رده‌می خۆی ئه‌كات و ئه‌فه‌رموێ: (أما الیوم فكل أحد **یخترع شیئاً، و یختلف افكا و كذبا، ملقیا زمامة الي الجهالة، غیر مفكر في الوعید للجاهل بسبب الایة)**.[1]

[1] مباحث في علوم القران، مناع القطان، ص٧٣.

دووەم ـ هەندێ جار زیاد لە (سبب نزول)ێك بۆ ئایەتێك باس ئەکرێ یان باسی زیاد لە کەسێك ئەکرێت کە فلانە ئایەتی لە سەر هاتبێتە خوارەوە, لەم کاتەدا زانایان بە کورتی ئەفەرموون: ئەگەر ئایەتێك زیاد لە (سبب نزول)ێکی هەبوو ئەوە هەنگاوەکانی (**تعارض** و ترجیح)ی لە گەڵدا پیادە ئەکرێت: واتە.

١ـ یەکەمجار سەیری (سند)ی ریوایەتەکە ئەکرێ, ئایا ئەو ڕیوایەتە بە (صحیح)ی هاتووە یان نا، ئەگەر یەکێکیان (صحیح) و ئەویان (**ضعیف**) بوو ئەوە, کار بە (صحیح)ەکە ئەکرێ و (**ضعیف**)ەکە ئەدرێتەوە دواوە.

٢ـ ئەگەر هاتوو هەردووکیان صحیح بوون ئەوە کار بە بنەمای (**الجمع** و التوفیق) ئەکرێ, واتە وادەکرێت کە ئیش بە هەردووکیان بکرێت, بۆ نمونە بووترێ.

* ئەم ئایەتە دووجار هاتووە تە خوارەوە.

* ئەم ئایەتە دەربارەی هەردوو ڕووداوەکە یان هەردوو کەسەکە هاتووەتە خوارەوە بە جیا.

* یەکەمجار لە سەر یەکێکیان هاتووەتە خوارەوە و دووەمجار بەسەر ئەوەی تریاندا خوێنراوەتەوە وەك: "**موناسەبە بوونی لەگەڵ یەکەمدا**".

٣ـ ئەگەر "**جمع و توفیق**" نەئەکرا ئەوە پێویستە پەنا بۆ "**ترجیحات**" ببرێت, واتە ڕیوایەتێکیان ترجیح بدرێت و ئەوی تریان بە "**شاذ**" دەربکرێت و **سقوطی** پێ بکرێت و کاری پێ نەکرێت و لێرەدا نهێنییەك هەیە پێویستە بووترێت, ئەویش ئەوەیە پێویستە (ترجیحات) لە ڕووی (مرجحات)ەوە بکرێت نەك لە ڕووی ئارەزووبازی و عەقڵکارییەکەیانەوە بێت و زانایانیش ژمارەی (ترجیحات)یان تا (١٠٠) بردووە، کە ئەیکەنە سێ دەستەی گەورەوە.

* "**مرجحات**" لە ڕووی (سند)ەوە.

* "**مرجحات**" لە ڕووی (متن)ەوە.

* "**مرجحات**" لە ڕووی بەڵگەی دەرەکی (قرینە خارجیە)ەوە.

٤ـ ئەگەر( ترجیح) نەئەدرا زانایان هەندێکیان ئەفەرموون پەنا ئەبرێت بۆ (نسخ) لە رێگەی زانینی مێژووی ڕیوایەتەکانەوە, خۆ ئەگەر مێژووی ڕیوایەتەکان ڕۆشن نەبوویەوە بۆمان ئەوە زانایان هەنگاوی پێنجەم ئەگرنە بەر کە خۆی بۆ خۆی ئەبێتە سێ خاڵ.

خاڵی یەکەم: هەندێ ئەفەرمون **"سقوط"** بە هەردوو ڕیوایەتەکە ئەکرێت بە پێی بنەما ئوسولیەکە کە ئەڵێت: (**اذا تعارضا تساقطا**) و کار بە **"براءة الاصل"** ئەکرێت, واتە هەر وەك وا بێت کە "سبب نزول" ی هەرنەهاتبێ.

خاڵی دووەم ـ هەندێ ئەفەرمون: مرۆڤی موسڵمان "ئیختیار"ی هەیە کار بە هەرکام لەو ڕیوایەتانە بکات.

خاڵی سێیەم ـ هەندێ ئەفەرمون کار بە هیچ کامیان ناکرێ و لێی ئەوەستێت تا زانایەکی تر و لە هەلێکی تردا قسەی کاربڕی تێدا ئەکات و کێشەکە یەکلا ئەکاتەوە.[١]

بە هەرحاڵ ئەم زانستی (اسباب نزول)ە خەریکە وەك مەسەلەی ناسخ و مەنسوخ و بابەتە مێژووییەکانی تری سەر بە زانستە قورئانیەکانی لێ دێت کە لەبری ئەوەی ئاسۆ لە بەردەم عەودالآنی قورئاندا دروست بکات و فراوانی بکات, کەچی پەرچ لە بەردەم موفەسیر و لێکۆڵەرەوەکاندا دروست ئەکات و دکتۆر (**طه جابر علوان**)ی وتەنی پێویستە سەرلەنوێ خوێندنەوە بکرێت بۆ ئەو باسانە و هەروا لە خووت و خۆرایی (سبب نزول)ێك نەکرێتە بەربەست لە بەردەم ئایەتێکدا کە دونیایەك مانا و مەبەستی شایستە و گەورەی تێدایە بۆ ئەم مرۆڤە و دەستی ئەگرێت بەرەو کەماڵ.

## باسی دەیەم: هەندێ زانستی تازەی سەردەم کە ئەخرێنە سەر زانستەکانی قورئان

یەکێك لە گەورەیەکانی ئەم قورئانە ئەوەیە کە فەرمودەکە ئەیفەرموێت (**لایخلق علی کثرة الرد ولا تنقضي عجائبه**). زۆر وتنەوە و خوێندنەوەی قورئان کۆنی ناکات و شتە سەر سورهێنەرەکانی ناویشی کۆتاییان پێ نایەت, بەڕاستی هەروایشە, ئەوەتا بە هەزاران زانای گەورە هەر یەکەو لە لایەکەوە ڕادەمێنێ لەم قورئانە و زانستی تازەی لێ وەردەگرێ. ئەدیبەکان سەرسام ئەبن بە ڕەوانبێژی قورئان لە ڕووی "نەصاحەت" و دووری وشەکانی لە

---

[1] ئەم بنەمایانەی (تعارض و ترجیح)مان لە زۆربەی کتێبە ئوسولیەکان دەرهێناوە و بە تایبەتی کتێبی "البیان في رفع غموض النسخ في القرآن ـ د. مصطفی زلمي". لە پێشەوەشدا لە باسی (ناسخ و مەنسوخ)دا ئەمەمان بە درێژی باسی کرد.

قورسی و ناسازییەوە چ لە ڕووی مانای بەرز و جوانیەوە چ لە ڕووی کورتی وشە و دەستەواژەکانیەوە کە زۆرترین مانا و مەبەست ئەگەیەنن سەیرکە بۆ نموونە خوای گەورە چی ئەفەرموێ.

(**ولهن مثل الذي عليهن بالمعروف**) کە بە پێنج وشە هەموو مافەکانی ئافرەتی سەلماندوە (**ولكم في القصاص حياة يا اولي الالباب**) کە بە سێ وشە "**في القصاص حياة**" حزوری بە گیانی هەموو یاسا جینائیەکانی پەیدا کردووە کە یەکێکی وەکو **مصطفي** صادق الرافعي لە "أعجاز القران"داو یەکێکی وەك شاە ئەحمەدی هیندی لە "**اظهار الحق**"ەکەیدا زیاد لە نهێنییەك و دوان و "دە" لەم ئایەتە دەردە هێنن.

(**خذ العفو وامر بالعرف واعرض عن الجاهلين**) چۆن بەو سێ دەستەواژە کوتە هەموو ڕەوشتە باشەکانی مرۆڤی چڕ کردوەتەوە, چونکە لە "**خذ العفو**"دا ئاشتبوونەوە و سەر لەنوێ پەیوەندی بەستنەوە هەیە بەوانەوە کە عادزت کردون، یان عادزیان کردوی, لێبوردنی تێدایە بۆ ئەوانەی ستەمت لێدەکەن, و شت بەخشینیشی تێدایە بۆ ئەوانەی کە شتیان لێگرتوویتەوە.

لە "وأمر بالعرف"یش هەموو ڕەوشتەکانی: لە خواترسانو پەیوەندی خزمایەتی پاراستن و بە دوورگرتنی زمان لە درۆو چاو پاراستن لە ناموسی خەڵکی ئەگرێتە خۆی..

دەستەواژەی (**واعرض عن الجاهلين**)یش گشت رەوشتەکانی ئارامگرتن و چاوپۆشی و نەفسبەرزیو دەمە دەمێ نەکردن لەگەڵ نەفامو نەفسنزمەکاندا و خۆدوورگرتن لە پاڵپاڵێن ئەخاتە ناو ئەو دەستەواژە کورتەوە.

یان سەیرکەی خوایگەورە بە دوو وشەی قورئانی کە ئەفەرموێ: "**اخرج منها ماءها ومرعاها**" چۆن کار و وەزیفەی ئەم زەوییەی هەموو چڕکردووەتەوە و دەری دەخات، هەر لە "قووت" و گژوگیاوە بیگرە تا ئەگاتە دانەوێڵەو بەروبوومو گەڵای دار و درەختو جلو بەرگ و ئاگر و "خوێ"شەوە، چونکە ئاگر لە شقارتەیە و خوێش لە ئاوەوەیە..[1]

هەر ئەدیبان لە چەند رووی ترەوە بۆ قورئانیان روانیوەو شتی سەرسوڕهێنەریان لێدەرهێناوە وەك وردەکارییەکانی وێنەگرتن لە قورئاندا یان لە باسو خواستەکانی قیامەتدا

---

[1] بۆ نمونەی زیاتر و شتی جوانی زۆر تر سەیری ل٣تا ل١٢ی "تأويل مشكل القرآن"ی ئیبن قوتەیبە بکە.

یان له نموونه هێناوەکانیاندا، بۆ راستی ئەمە سەیری: **"التصوير الفني في القرآن، سيدقطب"** بکە بۆ یەکەمیانو هەروەها (مشاهد القيامه) بۆ دووەمیانو **(الأقسام في القرآن، إبن قيم الجوزية)** بۆ سێیەمیان بکە.

زانا جیۆلۆجییەکانو دکتۆرە دەروونییەکانو دکتۆرە گشتییەکانو باحیسە عەودالّەکان هەریەکەیان لە گۆشەنیگای پسپۆڕی خۆیانەوە روانیویانە بۆ ئایەتەکانی قورئانو سەیریان کردووە کە ئەم قورئانە پڕ پڕە لە شتی عەجایب و سەرسوڕهێنەر. نەك هەر ئەمە، بەڵکو ریفۆرمخوازە کۆمەڵایەتییەکانیش لە قورئانەوە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندو پڕ دەرمانیان دۆزیوەتەوە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونیو جەستییەکانی ئەم مرۆڤە.

بە کورتی چەندین زانستی تازە لە قورئان دەرهێنراون کە ئێمە تەنیا ناوەکانیان ئەبەینو لەسەریان زۆر ناڕۆین بۆ ئەوەی کتێبەکە لە قەبارەی دیاریکروای خۆی دەرنەچێت:

١ـ زانستی چارەسەرە قورئانیەکان:

أ ـ چارەسەرە رۆحیو دەروونییەکان.

ب ـ چارەسەری تێکەڵبوونی پەری لەگەڵ مرۆڤەکاندا.

ج ـ چارەسەری نەخۆشییە جەستییەکانی دەرو ناو.

د ـ چارەسەری نەخۆشییە کۆشندەکانی وەك (شێرپەنجە بۆ نموونە).

ئیبن قەیمی جەوزیە لە تەفسیری ئایەتی **(وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُوراً)** (الفرقان: ٣٠) دا ئەڵێت:

دوورکەوتنەوەو جێهێتشنی قورئان چەند جۆرێکە:

یەکەم: نەخوێندنەوەیو ووردنەبوونەوە لە ماناکانی.

دووەم: کار پێنەکردنیو باوەڕ پێنەبوونی.

سێیەم: بەکارنەهێنانی وەکو چارەسەری نەخۆشییەکان..

چوارەم: گوێ بۆ نەگرتنی.

پێنجەم: داوەری نەکردن بە قورئانو نەگەڕاندنەوەی کێشەکان بۆ لای ئەو..[1]

هەندێ بە توانجەوە ئەڵێن: قورئان کتێبێکی پیرۆزەو بۆ ئەوە هاتووە ببێتە هیدایەت بۆ خەڵکیو نکولی لەوەش ناکرێ کە پرنسیپەکانی تەشریعو دەستوری تێدایە، بەڵام یانی چی ئەشیکەنە کتێبێکی **"طبي"**و چارەسەری نەخۆشی پێدەکەن؟!

---

[1] الطب النبوي، پەراوێزی (عالج نفسك بالقرآن، القرآن شفاء الأرواح والابدان، الشيخ حسن رمضان، ص٢٦).

لەوەلاّمدا ئەڵێین: "خوای گەورە ئەم قورئانەی ناردووتە خوارەوە بۆ ئەوەی وەزیفەیەکی زۆر هەیە ئەنجامی بدات، لەوانە: دەرهێنانی خەڵك لە تاریکایی بۆ رووناکی رۆحو دەروون، هەروەها بۆ ئەوەش ناردوویەتی بنەماکانی دەستوورو یاساو تەشریعات رۆشن بکاتەوەو عەقڵەکان بجولێنێ بۆ ئەوەی ئالیەتی جێبەجێ کردن بۆ ئەو بنەمایانە بدۆزنەوەو، وەزیفەی ئەوەشی داوەتێ کە لە نوێژەکاندا بخوێنرێتەوەو عیبادەتی پێ بکرێتو بەرەکەتی لێوەربگیرێ و وەزیفەی شیفابەخشینیشی داوەتێ کە هەرکەس بەو نێتو نیازەوە رووی لێ بنێ خوای بۆی بکاتە (شیفا) ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێ: (**وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ**) یان ئەفەرموێ: (**وَهَـذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ** ). هەروەها ئەفەرموێ: (**قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاء**). هیچ رێگرییەکیش نییە لەوەدا کە قورئان هەموو ئەو وەزیفانە بە جوانترین شێوە پێکەوە ئەنجام بدات).[1]

**٢ـ** زانستی "میتۆدە زانستییەکان بۆ لێکۆڵینەوە لە ئاینەکان" دکتۆر **مصطفى حلمى** لە کتێبی "الاسلام والادیان"و لە ل١٩دا باسێکی ئەم زانستە ئەکات کە چۆن قورئان بنەماکانی داناوەو دەستی لێکۆڵەوان ئەگرێت بۆ برەودان پێی.

**٣ـ** زانستی "خوێندنەوەی گەردوون و قورئان پێکەوە"، دکتۆر (**طه** جابر العلوانی) لە کۆکردنەوەی هەوڵێکی وەهادایە کە بیسەلمێنێ پێویستە گەردوون و قورئان پێکەوە بخوێنرێتەوە، چونکە چ قورئانو چ گەردوون هەردووکیان دیاری دەستی خوانو ئەمیان ئەویان و ئەویان ئەمیان راڤەو تەفسیر ئەکات، لە قورئانەوە تەرجەمەی گەردوون وەردەگرىو لە گەردوونەوە تەرجەمەی قورئان فێر ئەبی، لە کتێبی (دراسات **قرآنية**) (٢) **الجمع بين القراءتين، قراءت الوحي وقراءة الكون**"دا لە ژێر ناونیشانی "**إخطاء قراءات منفردة وسلبياتها**"دا دەڵێت:

ئەوەت بۆ رۆشنبوویەوە کە خوێندنەوەی قورئان و خوێندنەوەی گەردوون هەردووکی پێکەوە یەکێکە لە فەرزەکانی خوای گەورە بەو مەرجو سیفەتانەی کە بۆیان دانراوەو کۆکردنەوەشیان پێکەوە شتێکی پێویستە و وانەکرێ کەلێنێکی گەورە دروست ئەبێت". پاشان ئەڵێت: "**فمن تجاوز القراءة الاولى في الوحي النازل الى النبيين واستغرق استغراقا كليا في القراءة الثانية التي تمثل الكون أو معارف الطبيعة منقطعة عن الله تعالى فقد**

[1] موسوعة الطب البديل الحديثة، موسى نادر، ص١٩٧.

**العلاقة بالله وتجاهل الغيب وانطلق بفلسفة انسانية مستقلة وضعية منبتة عن الله، عورات قاصرة في مصادرها تحاول ان توحد بين الانسان والطبيعة باطلاق وتعد الخالق والغيب كلّه مجرد ماورائيات او ميتافزيقا يمكن تجاهلها او تجاوزها !".**[1] پاشان ئەوە باس ئەكات كە ئەو جۆرە كەس و ئەو جۆرە فەلسەفانەی كە دوور لە خوێندنەوەی (سروش)ەوە لە دایك ئەبن یان باسی خولقاو خولقێنەر ناكەن یان ئەگەر باسیشی بكەن هەر ئەوەندە باسی ئەكەن كە یەكەمجار گەردونی دروست كردوە و دوای ئەوە ئیتر لێی گەڕاوە خۆی بەردەوام بێت بە شێوەیەكی ئۆتۆماتیكی و هیچ جۆرە بەرچاو ڕوونی و ڕاسپاردەیەكی بۆ نەناردووە, خۆ ئەگەر یەكێك لەم (فەلسەفەچیانە) باسێكی خواشی كردبێت یان حەز بكات ئەو باسە بكات ئەوە بە هەموو عەقڵێكەوە ئەڵێ: ئەو خولقێنەرە لە ناو خولقاوەكانیدا تواوەتەوە و ئاوێتە بووە لە گەڵیاندا و بەو شێوەیەش مرۆڤ خۆیی و عەقڵی خۆی لێ ئەبێتە خواو جگە لە"سروشت" هیچی تر نابینێ و لەوە تێناگات كە گەردوون لە سەر یاسا و دەستورێك ژێر بارخراوە بۆ ئەم مرۆڤە و هەڵسوڕاندن و ئیدارەدانی بە دەست خوایەكی خولقێنەری بە توانایە و پێویستە گوێ بە راسپاردە و ڕێنماییەكانی بدرێت و گەندەڵی و ستەم بەرپا نەكرێت.

پاش ئەمانە ئەڵێ:" **اما اهمال القراءة الثانية في الكون و الطبيعة المسخرة والا قتصار علي قراءة الوحي وحده منقطعا منبتا عن الوجود فانة يؤدي الي نفور الدنيا واستقذار لها و لما فيها، يشل طاقات الانسان العمرانية و الحضارية و يعطله عن اداء مهام الخلافة و الامانة و العمران و يحول بينه و بين التمتع بنعمة التسخير و يعطل فكره و ينقص من قيمة فعله, بل قد يلغي اداراكة لفعله فلا يري الانسان نفسه فاعلا في شيء و لا يري لوجوده في الحياة معني عمرانيا".**[2]

دوای ئەمانە ئەڵێ: كەواتە پێویستە ئەم دوو خوێندنەوەیە پێكەوە گرێ بدرێن: خوێندنەوەی (سروش) و خوێندنەوەی (سروشت) تا عەقڵی مرۆڤایەتی پێ بینا بكەینەوە و نەیەڵین مرۆڤ بكەوێتە ئەو دوو هەڵە كوشندەی كە ئەو دوو خوێنەرەی تێدەكەوێت.[3]

---

[1] سەرچاوەی ناوبراو (ص٢٢ـ ٢٣).

[2] الجمع بين القراءتين ـ العلواني، ص٢٦.

[3] هەمان سەرچاوە. ل٢٧.

ئیمامی رازیش ئەفەرموێ: "ان لله **كونان** كون **منظور** و كون **مقروء** فكلما زاد علمنا بالكون **المنظور** ازددنا علما بالكون **المقروء**"[1], نەك ئەمە، بەڵكو "بریسلی" خاوەنی كتێبی "**الإنسان** و الزمن" ئەڵێ: "ئەم گەردوونە خاوەن عەقڵێكی گەورەیە".[2]

٤- دەرهێنانی تێورەكانی پەروەردە لە قورئاندا: كە زانایان توانیویانە و تەنیا لە سۆنگەی قورئانەوە بەرنامەیەكی پەروەردەیی هەمەلایەنە بۆ پەروەردە كردنی ئەم مرۆڤە لە منالیەوە تا پیر بوون دەربهێنن, نەك بۆ پەروەردەی جەستەیی یان ڕۆحی و دەروونی، بەڵكو بۆ پەروەردە كردنی بیرو بیركردنەوە و دڵ و دەروون و ڕەوشت و هەستەكانی, بۆ پەروەردە كردنی ژن و پیاو بۆ پەروەردەكردنی منالّ و گەنج و پیریش, واتە هەم پەروەردەیەكی هەمە لایەنە و هەم پەروەردەیەكی هەموو كەسی.

بە هەرحاڵ ئەم قورئانە "كلام **الله**"یە و سروشتییەكە خوای گەورە فەرمودەی خۆی بئاخنێ بە شتی سەرسوڕهێنەر و تا دونیا دونیا بێت "افكار"و زانستی جۆراو جۆر بداتە ئەم مرۆڤە, مەگەر خوای گەورە نافەرموێ: (**لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَاداً لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَداً**) (**الكهف:١٠٩**). لە ئایەتێكی تریشدا هەر ئەفەرموێ: (**وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ**) (**لقمان: ٢٧**). مانای ئایەتی یەكەم ئەوەیە: ئەگەر دەریا هەموو ببنە "مرەكەب" بۆ نووسینەوەی ووشەكانی خوا, دەریاكان هەموو تەواو ئەبن پێش ئەوەی ووشەكانی خوا تەواو ببێت با پاش ئەوەش چەندجارێ دەریاكان بكرێنەوە بە مرەكەب. ئایەتی دووەمیش یانی: ئەگەر هەرچی درەخت هەیە لە سەر زەویدا هەموو بكرێنە قەڵەم و دەریاكانیش بكرێنە مرەكەب و پاش ئەوەش حەوت دەریای تریش بكرێنە مرەكەب وتەكانی خوا هەر كۆتاییان نایەت, و دڵنیا بن كە خوا بە توانایە و داناشە.

هەروا خوای گەورە ئەفەرموێ: (**إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلاً ثَقِيلاً**) (**المزّمِّل: ٥**). واتە: قسەیەكی سەنگین، كە خوای گەورە ئافرەتی دووگیان ئەڵێت: "**فلما اثقلت**" كاتێك كە قورس و سەنگین بوو..

---

[1] القران منهل العلوم، ص١٥٥.

[2] هەمان سەرچاوە ص١٥٣.

له بەر ئەوەیە ئێمەی موسڵمان لە ناخمانەوە بڕوامان وایە کە ئەم قورئانە وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وآله وسلم) دەربارەی ئەفەرموێ: **"لايشبع منه العلماء ولا تخلق من كثرة الرد ولا تنقضي عجائبه" رواه الترمذي.**[1]

[1] جامع الترمذي (٥-١٧٢).

# بەشی چوارەم:
# لێکۆڵینەوە لە هەندێ هەڵسوکەوت لەگەڵ قورئاندا

## دەروازەیەك

ئەم قورئانە کتێبێکی موبارەکە و پڕیەتی لە بەرەکەت "**وهذا کتاب انزلناه مبارك**" جێگەی خۆیەتی بەرێزەوە بەردەوام لە بەردەمیدا چۆك دابدرێت و ڕێنمایی و عەقڵ و بەرەکەتی لێوەربگرێت."حسن البنا" ئەڵێ: هەڵوێستی خەڵکی ئەمڕۆ لە قورئان وەك هەڵوێستی کۆمەڵە خەڵکێکە لە ناو تاریکایەکی ئەنگوستە چاودا هەردێن و دەڕۆن و سەرسمت ئەدەن و ڕوناکییەك شك نابەن, جارێ ئەکەونە چاڵ و جارێ ئەکەون بەسەر بەردێکدا و جارێ ئەکێشن بە ناو قەدی یەکتریدا و هەروادێن و دەڕۆن لەو تاریکستانەدا کەچی کەسیان بیر لەوە ناکەنەوە کە دەستێك بەرن بۆ ئەو پلاکە کارەبابییەی لە نزیکیانەوە داکوتراوە, کە هەر ئەوەندەی دەستیان بەری کەوت گڵۆپێکی پڕ ڕووناکی گەورە دائەگیرسێنێ و لەو تاریکاییە ڕزگاریان دەبێت. ئەمە نموونەی خەڵکە لەگەڵ کتێبی خوادا و هەڵوێستی خەڵکە لەو کتێبە موبارەکە.![١]

هەر لە کۆنەوە زانایان هەوڵیان داوە کە کتێبی تایبەتی بنووسن لە سەر چۆنێتی هەڵسوکەوت لەگەڵ قورئاندا, چونکە قورئان وەك هیچ کتێبێکی تر نییە، پێویستە مامەڵەی تایبەتی لە گەڵدا بکرێت لە لایەك بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی شایستە و گونجاو بە قورئان ئەو مامەڵەیە بکرێ و لە لایەکش بۆ ئەوەی قورئان خوێن سوود مەندبێت لە قورئان و بە دەستی خاڵی هەڵنەسێتەوە لە قورئان خوێندنەکەی . ئیمامی **سیوطی** ئەڵێ: چەندینی وەکو: "ابوبکر بن شیبە" و "نسائی" و "ابوعبید قاسم بن سلام" و "ابن الفرس" و چەندانی تر کتێبی تایبەتیان لە سەر ڕێز و گەورەیی قورئان و قورئان خوێن داناوە.[٢] یەکێك لەو کەسانە کە کتێبی چاك و تایبەتی لە سەر قورئان و قورئان خوێن داناوە. ئیمامی

---

[1] نظرات فی کتاب الله, حسن البنا, ص٣٠ پەراوێزی أصول التربیة الاسلامیة ـ د. سعید إسماعیل علي، ص١٥١.

[2] الجامع الصغیر (٢، ٣١٠ـ ٣١٢).

نەوەویە بە ناوی **"التبيان في اداب حملة القران"** کە سەرچاوەیەکی گرنگی ئەم بەشەی ئێمەیە، لە زانا هاوچەرخەکانیشدا شێخ زورقانی بەشێکی گەورەی کتێبەکەی بە ناوی **"مناهل العرفان في علوم القرآن"** داناوە بۆ چۆنێتی مامەڵە لەگەڵ قورئاندا و بەڕێز "فەرەج توفیق"یش کە زانایەکی گەورەی عێراقییە کتێبێکی بە ناوی: **"المدخل في فقه القران بحث مقارن"** داناوە کە دیسان سەرچاوەیەکی پشت پێ بەسراوی ئەم بەشەی ئێمە دەبێت.

گرنگی هەڵبژاردنی ئەم بەشەی کتێبەکەمان لەوە دایە کە زۆرکەس یان چۆنێتی هەڵس و کەوت نازانێ لە گەڵ قورئاندا یان زیادەرەوی ئەکات و مامەڵەیەك ئەکات لە گەڵیدا توند ڕۆیشتن و ڕۆچوونی تێدایە یان هەیە زۆر کەمتەرخەم و لاموباڵە بە ئادابەکانی مامەڵە لە گەڵ قورئاندا بەڵام لە ڕاستیدا وەك خوای گەورە ئەفەرموێ: **(وكذالك جعلناكم امة وسطا)** ئێمە ئێوەمان داناوە کە ئوممەتێکی مامناوەندبن. کە دیارە لە هەموو کایەکانی ژیاندا پێویستە هەروا بن نە ئەمسەری بێ موباڵاتی ـ **تفریط** ـ نەئەوسەری ڕۆچوون و دەمارگیری ـ **افراط** ـ بگرن.

## باسی یەکەم: هەستان لە بەر قورئان

هەندێ کەس لە خۆڕایی ئەچێت بە گژ ئەو کەسانەدا کە لەبەر قورئان هەڵدەستن و ئەڵێن: شتێك کە پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** و صەحابەی کیرامی ئەو نەیکردبێت ئێمە بیکەین بیدعە و داهێنانە و لە جیاتی ئەوەی خێرمان بگات, گوناهمان دەگاتێ, لەم لاشەوە هەیە شەڕی توند لەگەڵ ئەوانەدا ئەکات کە لە بەر قورئان هەڵناسنەوە و بە جۆرێك لە کەمئەدەبی و نەفامی ئەزانن، بەڵام ڕاستی مەسەلەکە بەم شێوەیە کە ڕوونی دەکەینەوە.

زانایانی ئیسلامی لەم مەسەلەیەدا سێ ڕایان هەیە.

١ـ دروست نییە هەستانەوە لە بەر قورئان کە ئەمە قسەی "عزالدين بن عبدالسلام"ە و بەڵگەکەشی ئەوەیە کە پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** و صەحابەی کیرام شتی وایان نەکردوە و پێغەمبەریش **(صلى الله عليه وآله وسلم)** ئەفەرموێ: (من عمل عملا ليس عليه امرنا فهو رد).[1]

---

[1] رواه مسلم(١٧١٨) ـ جامع العلوم و الحكم(١ـ١٧٦).

